# نووسەری کورد

گۆڤاری
یەکێتی ئەدیب و نووسەرانی عیراق
نووسینگەی رۆشنبیری کوردییە

ژمارە ٢ خولی سێهەم ئابی ١٩٨٥



سەرپەرشتی چاپ
محمد زەهاوی

دەرهێنانی هونەری
عبدالقادر علي مردان

کۆمەڵی نوێنەرانی میسۆپۆتامیاو عەدەن و سۆماڵ قاهیرەیان لە ڕۆژی ٢٥ مارتدا بەجێ هێشت، بەڵام ڕاوێژکاری دارایی ی مەندوبی سامی میسۆپۆتامیا لە قاهیرە مایەوەتا ٢٧ مارت بۆ ئەوەی لە سەر گیرو گرفتی دارایی ئەم وڵاتە لەگەڵ سێر بارستاو گفتوگۆ تەواو بکات. دوا بەدوا بارستاو قاهیرەی بەجێ هێشت و چووە قودس.

٧ - پوختەیێکی ئەو بڕیارانەی کە لە سەری ڕێك کەوتون لە بەشی تایبەتی ئەم ڕاپورتە دیار دەبێت. کە ناوەڕۆکی تەواوی کۆبونەوەکانی لێژنەکان وەکو پاش بەند لەتەك ئەم ڕاپورتە دایە.

## ٢ - میسۆپۆتۆمیا

١ - پرۆگرامی ئەم وڵاتە (بڕوانە پاش بەندی ژمارە ٥) لە لایەن دوو کۆمیتەوە باسی لێوە کرا: لێژنەی ڕامیاری بە سەرۆکایەتی وەزیری ناوبراو (پاش بەندی ٦)؛ لێژنەی سوپاو دارایی بە سەر پەرشتی سێر وۆلتەر کۆنگریف (بڕوانە پاش بەندی)... گرفتی هێزی سوپاو هێزی ئاسمانی باسیان لێوە کرا.
٢ - کۆنگرە بڕیاری لە سەر ئەوەدا کە باری ڕامیاری بە جۆریکە پێویستە حاکمێك لە نەوەی شەریفی (مەکە) بۆ وڵاتی میسوپوتامیا هەڵبژێردرێت. باشترین کەسیش لەمان (میر فەیسەل) ٥.
کۆنگرە لە سەر ئەم باوەرە دابوو کە حکومەتی بەریتاتی ناتوانێت میر فەیسەل هەڵبژێرێت بەڵکو ئەبێت لە لایەن خەڵقی وڵاتەکە خۆیان هەڵ بژێردرێت... بەڵام حکومەتی بەریتانیا کۆشش بۆ هەڵبژاردنی دەکات (پاش بەندی ژمارە ٩).
٣ - بە ئاواتی ئەوەی کە ئەم پرۆگرامە بە پوختی دیتە کایەوە، کۆنگرە بڕیاری دا کە هێزی چەکدار لەم وڵاتەدا تا ڕادەی تەنیا ٢٣ تیپ کەم بکرێتەوە، ئەمەش بە زوو ترین کات.. بە پێی لێکدانەوەی تایبەتی ئەم کەم کردنەوەیە لە فەلەستین و میسۆپۆتامیا تارادەی ٥رە ملیون لە ساڵی ١٩٢٢ - ١٩٢٣ پاشکەوتی دەبێت، هەر وەها پاشکەوتی تریش لە دوایەتی.
٤ - کۆنگرە لە سەر ئەم باوەرە دایە کەوا هەر جۆرە کۆششێك بۆ زۆر لێ کردن لە ناوچە کوردیەکاندا. دەبێتە هۆی بەرهەڵستی و تێك هەڵچوون. (پاش بەند ١٠) [لە خوارەوە بەکار دەهێنرێت].

گیانیان لێسەند،
بەڵام بیری زەق و زندووی
بۆ نەوەمان
«جیل» لە دوای «جیل»
جار لە دوای جار

● * ● * ●

## سۆکرات ووتی؛

من شەهدی دیمۆکراتیم
با ژەهریشم دەرخوارد بدەن
لە ویژدانی خەڵکا ئەژیم...!
من بیردۆزی دیمۆکراتیم
من سۆکراتم،
ئاگر خۆشکەری خەباتم!..

● * ● * ●

## ● گالیلۆ...

وا زەوی یە، هەر ئەسووڕێ و ئەخولێتەوە
با حەپسم کەن، برسیشم کەن
سەرم لە لاشەش بێتەوە
زەمین هەر ئەسووڕێتەوە... !
زەمین هەر ئەسووێتەوە... !

● * ● * ●

## ● ژان دارك...

کە سووتاندیان
ووشەکانی بوون بە خەرمان..!
بوون بە ئاگر......
تەمی تاریکی ئەڕەوان
بیری ڕۆشن

لە سەر زەوی بوونە خۆراك
بوونە هەوێن؛ بوو بوونە ماك..
ژان دارك ووتی:
واز لە ئازادی هێنانم،
واز لە ژینە!.
چڵو چێوەکەی سووتانم،
بۆ هەموو مرۆڤ پەرژینە.
رووناکی‌یە گڕە، تینە...!

## ● حەللاج...

کە حەللاجیان وەك بەرخی نێر سەر بڕی
پەڕە پەڕە تەورات و ئینجیلیان دڕی..!
جارێ دەست و، جارێ پێ‌یان
لێ ئەقرتان..
خوێنی تکایە سەر زەوی
بوو بە «ئایەت»، بوو بە «قورئان».
کە سەریان لە لاشە قرتان
ئەیووت منم ڕاستی‌ی ژیان!
منم ماف و ڕەوای ئینسان
کە دەست و پێ‌یان ئەقرتان...

## ● عبد الخالق...

هەرچی ڕق و کینە هەبوو
لە مرۆڤ و خەلکی نەبوو
ئەوەی هەیبوو؛ دلسۆزی بوو
زانست پەرست، بیر دۆزی بوو
بۆ کوردی بوو، بۆ هۆزی بوو

وەکی ژەهرا کورەماران!!
ئێدی چ جار. . نفشێ وان ژی. .
نابن هەڤالێن مللەتیو. .
هەر دەم، هەر گاڤ.
دێ مێژن خوینا هەژاران.
دێ بن مەتال بو نەیاران.
ئو هەرو هەر بو نەیاران!

★ ★ ★ ★

دلێ من دلەك شەیدایەو
ئەوە مەشکا خەماد کێتن!!
دلێ من ئەڤروکە ئاشەو. . .
ئەوە هەڤراناد هێریتن!!
دەنگە. . دەنگە. .
کوتەلا وی گەلەك تەنگە!
تێهنێ لێڤێن لێ هشك کرین
تێرا وی ئاڤ ژێ ناهێتن.
بەندو بەرئاش بهێی خرتە بوین
خرە خرەو دنگە دنگەکا مەزنە.
دەولەت سەرێ سەرکاروانێن گوند کێمە.
دلو پەکا دوهنی نینە،
بسەر برغوییێن ویدا بەردەم
تێهنا لێڤێن وی بشکێتن.
بشێت هەڤراناب هیتریتن.
کاروانییاب رێ بێخیتن. . . !!
تێرك و گوینیو جهالێن دەربەدەران

داگرتینه، وێ ل رێزێو ملبملن
کاروانی ژی..
بەلنگازن، هەمی ژارن.
دلکەسەرو دلکوڤانن،
هەمی گاڤان.. بلاب زانن..
ئەو گەهدارن
چنکی ئەژی.. هەژارەکم ئاشەڤانم
ئو هەڤرانێ..
ڤێ دەولا ئاشێ دلێ من
برین و کوڤان و خەمن!!!
ب ر یـ ن و
کـ و ڤـ ا ن و
خ ە م ن!!!

★ ★ ★ ★ ★

چاوەکەم خۆ من برینداری خەدەنگی چاوی تۆم
زارو بیمارو گرفتاری کەمەندو داوی تۆم

وێڵو سەرگەردانو عاجزو ئاشفتە حاڵ
دڵ بە تاڵان چوی سوپای کاکوڵی تێك ئاڵاوی تۆم

گەر دەپرسی دادو گریانو فیغانت بۆچییە
ڕاستە ئازیز مردە نیم ئەمما جگەر سوتاوی تۆم

- هجری -

رۆناهیێ
دا بەتن ژوور
بکەڤت هەمی
دل‌و مالا
ژکەڤن رۆژێ
تاری‌یا ڕەش
وێ رەڤاندی‌و
دێ رەڤینت

● ● ●

چیا سەر بەرزو بلندە
باهۆزێ لەرزاندو هەژاند؟
لاڤو لێمشتێ چەنگێ خو ئاراند .
شاخ.... کەڤرو دول
نەراست کرو
هەر نەلڤاند رماند...
بەفر هات‌و چیا ڤەگرت
نەهێلا دول
نەهێلا تۆل جوان
دەمێ بوری
چ.. کورت.. درێژ
بەفرا دەلال
جولان هەژاو بەهەشت بهشت
ئاخێ مێژاند
سیسن.. نێرگز
گـولو هەلاڵ
کەتن ملا
هیڤی نوی‌بون ل‌نێڤا دلا

● ● ●

گورک بو تەرشی
دل هەرشی
ژبەرێ ژکەڤن
هەمی دەما
زڤستانا
گەل هاڤینا.
سرو سەرما
کەل‌و گەرما.
لسەرێ کوپا
دول.... نهێلا
ناڤا چەما.
گوری گوشتێ کال بەرانی
دانا ناڤا کون‌وخانی.
لێ... بەرخ‌و کارا
دەلەلەانێت گوری
کرنە رستک‌و هەژاندن
سەر نشیڤاو بەر پەسارا

● ● ●

بیشەنکە
بەفرە.. داروگولە
رهێن بنیاتا
چەند دلە،
بو ژوور ئەوا رۆژا ئانی
لەوا ئاڤایە ئەڤ خانی

● ● ●

بۆیە کۆنگرە پێش نیاری ئەوە بوو کە کاروباری ناوچە کوردیەکان راستەخۆ لە لایەن مەندوبی سامی‌یەوە بەرێوە ببرێت، تا وەکو ئەو کاتەی کە ئەنجومەنی شورای کورد بیرو ڕای یەك بوون لە گەڵ عیراقدا دەر دەبرێت. یێکەك لە سوودی ئەم بۆچوونە رامیاریە ئەوەیە حکومەتی بەریتانیا دەتوانێت هێزێکی سوپایی لەکوردەکان دامەزرێنێت بەسەر پەرشتی ئەفسەرانی ئینگلیز. لە دوواییدا ئەم هێزە لە جێگای بەریتانیەکان باشتر دەتوانێت سنورەکان بپارێزێ (پاش بەند ١١).. بۆیە بریار درا کە هێزی لیفی بە تیپی کوردو ئاسووری هێزتر بکرێت.. بەو ئاواتەی کە هێزی ئیمپراتۆری بەریتانی لە دەورو بەری سنووردا کەم بکرێتەوە. پیلانێك رێك خرا بۆ ئەوەی میسوبوتامیا لە ژێر باڵی هێزی هەوایی بەریتانیا بپارێزرێت (پاش بەند ١٣)...

ئەمەش هەمیشە بۆ ئەوەی ماوە بدرێتە هێزی ئاسمانیو سوپایی و فرۆکەی بازرگانی لە رێگا بەهیندبگات (بەشی ە، برگە ٣).

٧ - ئەم پێش نیارانەی خوارەوە پێشکەش کرا بۆ ئەوەی زوو بە پەنابەرەکانی جوڕ جوڕ بە شێوەیێك دابمەزرێن یا نە گوازرێنەوە. چونکە ماوەیێك بوو ئەمان لە سەر ئەرکی دارایی ئیمپراتوری بەریتانیادا بەرێوە دەچوون.

أ - ئەرمەنەکان - ژمارەی یانزە هەزار بەرانی ئەرمەن لە ناوچەی بەسرەدا دەژین.. ئەمان بە بێ دەرامەتی لە ساڵی ١٩٢١ - ١٩٢٢ مابوو نەوە.. بویەکونگرە بریاری‌دا ئەمان بەگەشتی بۆ لەنگەرێك لە سەر دەریای رەشدا بگوازرێنەوە..

ب - رووسەکان...

ج - ئاسوریەکان - مەندوبی سامی بەریتانی لە میسوّپوّتامیادا بە ئەمانەی راگەیاندووە کەوا هیچ جورە دەرامەتێك بۆ خەرجی ئەمان لە ساڵی ١٩٢١ - ١٩٢٢ تەرخان نەکراوە. واتا لە یەکی نیساندا (١٩٢١) خێوەتەکانی پەنابەرەکان دەپێچرینەوەو لول دەدرێن...

٨ - گیرو گرفتی دارایی جۆر جۆر لە لایەن کۆمیتەکانی لە ژێر سەرپەرشتی وەزیری ناوبراودا لێیان کوڵرایەوەو لەگەڵ سێر بارستاو باسی چەند پێش نیارێك کرا (پاش بەند ١٥).

راسپاردەکانی دووایی سیر بارستاو لە لایەن وەزیرەوە پەسەند کران.

٩ - رێگای ئاسن باس کرا (پاش بەند ١٦).

# بەهار

ساجد ئاوارە

١٩٨٣/٣/١١

نێرگزە جاڕی شارەزوور
بۆنی ئێوە، واهات لە دوور
چاوی گەشتان دەیسەلمێنێ
ئەم خاکەمان هەر دەمێنێ
ئازاری گەش لە ئاسۆدا
بەڵگەی مافی کوردان ئەدا
لە ژێر سایەی ئەم شۆڕشە
نێرگزە جاڕ چاوی گەشە
قەڵبەزی تاف بەستەی پێیە
پۆل پۆلی ماف، وا لە ڕێیە

تێکەڵ بە زێی دیجلە بووە
تا کورد مابێ، هەر زیندووە
گەردنی بەرزی دار خورما
لە دار بەڕوو سڵاو ئەدا
هاورا ئەکات، بە دەنگی بەرز
دوژمنی هەردوو، دێنێتە لەرز
دوو درەختین، دوو دەوەنین
لە مێژوودا، زۆر ڕەسەنین
نە هێزمەیە لە بە کمان بکا
نە هێز هەیە، هیچمان بکا.

# تۆف

دەڵێن مرۆڤ گەورەترین سەرمایەیە

١٩٨٥/٣/١٤

لەم بەهارە دا..

لەم کڵت و دۆخ و بارەدا
بە ئاسمانی شینی شارەزوور
هەورێکی خەست و چڵکن، هات لەدوور
بەری ئاسمانی روونی گرت
خاکی شارەزووری دا، گرت

ڕێژنەی باران بوو بە (تۆف)
هاتە گوێ دەنگی ئاخ و ئۆف
پیرەدار و نەمامی ریشە کێش کرد
هێلانەی پەلەوەرانی بەگشتی برد
گوندو دێهاتی وێران کرد

• • •

دەیویست ئەو تۆفە قەد نەبڕێ
تاکو هەناسە، لەبەر هەناسەدار ببڕێ

• • •

لێی هاتمە دەست، بە رووح
پەلم هاوێشت..
وەک کەشتی نوح

........

بەلای چەپم دا.. مرۆڤ هەڵدەزنا
بەلای راستم دا.. مرۆڤ هەڵدەزنا
هەموو چنگیان لە هەرمێی دڵم..
... گیر کرد
لە ڕێی نرخی ئەوانەدا...
.. لاشەم وورده وورده بۆ خۆی دەمرد

# ئەگەر

١٩٨١/٧/٩

ئەگەر وەك من، بهاتایە
گشت ئەم خەڵكە
تیشكی رۆژی بویستایە
ئەگەر وەك من... بهاتایە
گشت ئەم خەڵكە
بە دەنگی مەل سەربەست بوایە
لە گوڵزارا...
... بۆنی گوڵی بكردایە
نازی خلكی بچێشتایە
بە سەر تلش و هاژەی چەما
بە سەر بەرزیی، رابوردایە
بكەوتایە...
... هەستایایە

برە نجا یە...
.. جۆگە ئاوی هەڵبەستایە
لە كارگەدا جمەی بایە
ئەگەر وەك من
گشت ئەم خەڵكە
پەڕەی سپیی.. بنوسیایە
گشت جوانیی سەر زەمینی...
... دەرخستایە
ئەی خەڵكینە... گەر وابوایە
دەمانگوت.. قەت نامرین و
... نەمرین و
جێمان وا، لە بەهەشتایە

# نەورۆز

ساجد ئاوراه

ئەم کوردستانە هەمیشە کلّ و نەوتی لە دلّ دایە
دلّی منیش بەچەشنی ئەو نەورۆزی هەر لە کولّ دایە
کلّ و نەوتی نیو ئەم خاکە بلیسەی هەر لە گردایە
نەورۆزی کورد باوەڕێکە، بورکانیکە دووایی نایە

# گــەڵای هەناســـــه

□ شەهاب عوسمان □

پێشکەشە بە گوندی ئیندەرقاش.

ئیندەرقاش گوندێکی نزیك شاری مهابادبوو

جەلادەکانی ساواما ٤٥ کوردیان تیا سەربڕی

وەکو درەختی
گوندێکی ڕووخاو
گەڵای هەناسەت.. دەوەرێتە ناو
گیانمەوە

* * *

ئەی درەختەکەی ئامێزی بەفر
چەندت لێ جوانە تارای پرووشە
غەم بە بێدەنگی دەبارێتە سەر
تەماشای سەوزت
لە خەمی منیش پێکێك بنۆشە
من ئێستا گیانم
گۆرانی یەکی پڕ لە ئاگرەو
هێلانەی ووشەی تەزیزاوە

* * *

پەنجەکانم
شانەی قژی دارستانی هەوارێ بوو
ئەم هەوارە بە تەوری کڕ
سوتێنرا
چریکەی سەدان پاساری تیا خنکێنرا
لەو ڕۆژەوە.. بوومە سەنگەر

لە ئاوزنگی هەڵمەت ئەدەم
لە ناو تۆزا.
دوژمن دێنمە سەرچۆکو
لەو ساتەوە
بانگی مژدەی سەرکەوتنی ئێوە ئەدەم

* * *

هەور بێدەنگە
وەك بێدەنگی تۆ
سپی دەنوێنێ
لە ناو هەناویا
مژدەی گزنگی خۆرت بۆدێنی

* * *

ئەی هاورێکەی
ڕۆژانی سەختیو دژواری
کاتێ تەلیسمی سنورت تێکشکانو
پەڕیتەوە
نانی ڕەقت لە چ ماڵێ کۆ کردەوە ؟
ئا ئەو ماڵە
ئاسکێك بوو
لە سێبەری سنورو تەلبەنگ دەترسا
ترسیت شکان
من تفەنگم لە بەر جوانی نەکردەشان
بۆ ئەوە بوو
چی تر هەناسە دیل نەبێ
چی تر ئەم نیشتمانە ڕەش پۆشە
مۆڵگای گورگو دەعبا نەبێ.

---

ئەم شیعرە لە هەردوو میهرەجانی شیعرو نەورۆزی یەکێتی ئەدیبانو نووسەرانی کورد لە سلێمانیو هەلێر خوێنرایەوە.

# بەردەباز

□ موکەڕەم ڕەشید تاڵەبانی □

ساڵەهایە. بە ڕێکاوەم..
لە ئاوێنەی درزبردووی مێژووی تاڵدا
نەنووستووم، خەوم نایە !
دارستانێك خەون و هیوام
لە دەروون و
لە دلدایە !
کاروانێکم..
سەری ماندووی پڕ پەژارەم
بەردەبازی سەد ڕێگایە !
لەشی سڕبووم
لە فەرهەنگی شڕوشۆڵی
نەبووندایە !!
دڵی سەوزم..
کۆترەیەکی پتورکاوی
جەنگەلێکی سووتێنراوی
بێ‌نیگایە !!
ناوی بەرزم
لەسەر دێڕی دەنگ و باسدا
بێ ڕێ، بێ‌شوێن،
بێ‌جێگایە !!

*   *   *

ساڵەهایە..
لە ئامێزی ووشەی گەش و
مانگی واتای دەربڕینی
دەروونەوە..
هاوار دەکەم..!
بەڕستەی خوێن
دەنگی بڵند پڕ شار دەکەم..!
هیچ ڕێبوارێك،
هیچ بەهارێك،
هیچ کەنارێك..
بە پیری ی دەنگەوە نایە !!
بوارەکان.. نامناسنەوە،
نسارەکان.. باڵی پشووم بۆ لێنادەن،
بنارەکان.. ڕێم پێ‌نادەن،
دیوارەکان..
لە دەروازەی یادگارێکدا
وێنەکەم هەڵناواسنەوە !
ساڵەهایە
کیژۆڵەی بەخت، پەری ی ئاوات
دەڵێت دێم و

چاوەڕێمو
هەرگیز نایە !!
چاوەڕوانیم
ڕووبارێکەو ڕووی تافگەکەی
لە دەریایە !!
دەریایش بێبنو مەنگ
بێدەنگ، بێسەنگ..
لەبز نایە !!

* * *

سالەهایە..
لە پێدەشتی سووتێنراوی هەستو نەستدا
خەون دەبینم،
لەسەر بالی مێژووی تاسە
نەشنووستووم،
لە جەنگەلی چڕی بیردا،
خەوم نایە !!
چاوە ڕوانم
خۆم کاروانم.. دێمو دەچم
زێ وبوارم.. هەلیش دەچم
پێی ئاواتم هەلهێناوەو
خۆری بەختم..
لێی هەلنایە !!

* * *

سالەهایە
دەمی پرسیار دەکرێتەوە،
بەسەد بزمار دەدورێتەوە !!
پێی چاوەڕوانی هەر کول دەبێت
خۆر هەلنایە..
پەری ی خەونیش.. لە تاریکی ی پەژارەدا،
هەر دەرنایە !!

١٩٨٤

## ٣ ـ فەلەستین

١ ـ کۆمیتەی فەلەستین بە سەرۆکایەتی سێر هێربرت سامۆیل لە١٦ی مارت دا گەیشتە قاهیرە. لە رۆژی ٢٣ مانگ بەرەو قودس بەرێ کەوت لە تەك وەزیری ناو براودا. ئاشکرا ترین سیاسەت ئەوە بوو کە پەیوەندی لە گەڵ ئەردوونی رۆژهەلاتدا هەبوو. (پاش بەند (١٧).

شەریف فەیسەل: ئەم پێویستە بۆ مەکە بچێت. لەوێوە بروسکە بۆ هاورێکانی لە مێسۆپۆتامیادا رەوانە کات. لەم پەیامانەدا روونی بکاتەوە کەوا لە بەر ئەوەی لە لایەن هاورێکانی هان دراوە کە روبکاتە مێسۆپۆتامیا، لە هەمان کاتدا لەبەر ئەوەی کە حکومەتی بەریتانیا بەمی راگەیاندوە کە ئەم حکومەتە هیچ جۆرە تەگەرەی لە پێش دانانێت، هاتوو هاوولاتیانی میسۆپۆتامیا ئەمیان (واتا شەریف فەیسەل) یان بوێت. پاش ئەوەی لەگەڵ باوك و براکانی راوێژکاری دەکات بریاری ئەوە دەدرێت کە ئەم خۆی خۆی پێشان بدات... و دان بە یاسای ئنتیدابی کە لە لایەن عوسبەت (ئەنجومەنی گەلانەوە) دامەزراوە بنێت. پاش ئەوەی کە دەگاتە وولاتی ناو براو، شەریف فەیسەل ئەبێت حکومەتی نەقیب تازە بکاتەوە، یانە حکومەتێکی نوێ دابمەزرێنێت.

**پاش بەندی دە**
**کـوردستـان**
**کۆری چوارەمی لیژنەی رامیاری**
**١٥ ی مارت ی ١٩٢١**

**ئامادەبووەکان:**

- مستەر وینستون چەرچل (سەرۆك).
- سێر پرسی کوکس
- خاتو ج. بیل
- کۆلۆنیل ت. أي. لورنس
- مێجور هـ . یو. یۆنگ
- مێجور نۆئیل (ئەندامی راوێژکار)
- مێجور پاددوك (ئەمیندار)

ئەم کۆمیتەیە دەستی بە لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی مەسەلەی کوردستانی

# چار

# تك ژ دلەكی

عەدنان ئەترویشی

نانو ئاگرو ڤین
خەم و مەی
دینو دیندارو دینار
هەیو نەی
دچەنتكامدا شویشەكێ
هێڕشن بەرەڤ بەژنا ژینێ
ڤەژینا من..
خارنو نڤستن
مێرانیە دكرن
شەڤەكەو هزار.. هزار
دستاڕی دهێڕن
دانێ مەژی، مەلو
شەڤو خویت
ژ شەڤا چراخۆ بۆ شەڤا چەماندی
تاریكرن
ژ خوینا جەرگێ من تێركرن
ڤەژینا من
كولەكە یالولیە پەر پەرتی
هزار هزار ئەڤیندار
یێ داستانا ژێرا دبێژن

ڤەژینا من
وابیە بون ونەبون
ب ئولا
بال سەر سینگێ تەکەم
ج خاچ کول وبرین
ج ناف وەلاتەکێ
وەك وەلاتێ من
یێ یێ سەروشوین
ج قورئان یت
یان دلکەکێ خەمکین
یان ستقانەکێ
بێ نیشان دئەڤین
جان.. تەدڵ
جەلجەل یت
سێدارامنل سە رڤەنابت
وێ ب سەر کەڤم
داقە لە نێ ڤی ژیب دەم
ودلکێ خوب کە هوینم قوناغە کێ
وێل، وێل
خەمێت خو
کت کتە ب هەلین
ددەریا دلادا
لە عل مراری مە ڤێدان
ددە یاچاڤادا
ئاوازێت بێ زمان
مەکرنە سرودستران
بوروژا گوینێ
کول نیف روژا روژ
ماین ب هویڤیا
رونیا سێزا
روژلە غە دارە بوی

ویل ویل
دیروسد ڤاچەرخادا ویل
رەش چویاب سەرواریّ
حەڤال (دەرویش) دامانی
نیّ بە رزە نەبویە
هەرا بالە بەرزە
کاغە زا کیڤارا
واخاندیە ب ریّز وتەرزە
ئاری هەستیّت ئاریا
مەردا نەمیّرا
لیّ بو خیّری نەبویە
گەرحەڤیر بوو
حەڤیرەکیّ ئاف ڤەدزە
ئابو بەریّ بابیّ ئەڤیناخو
هیّڤەبدە..؟
پیّلیّ بەری ڤاکەمیا
ددن دە ربەندیّ مرنیّ
لوسڤاتو
بەری رویکیّ خوییّ خەمگین
حیّفەبدە ؟
بەژیّ تیّ دوتنی ژعە تسقیّ
مەژبەری بیّرکرنیّ
خانی: بەرپەری گەف وهوزانا
ڤەکە..
بەزە لینە کول وکەسەرا
وەشە کیّت کەنونیە مژهەنکا کولا
بەری بەیڤا
ددن سویکا پە یف مژوتنیّ
خودی: دیبەریّ خوبدە ڤی وەلاتیّ
ئەڤی ویّرانی
دائەم بەکەین تڤیّژە کا باوە ییّ

# پەلکە زێڕینەی ووشە

فەرەیدون مامە سامان

- بەقەد حەزی گەورەی پۆلە مەلێ هەڵدەفرم
بەرەو بەرزاییی‌یە دوورو بێ کۆتاییی‌یەکان
هەڵدێدێی چیاو..
لووتکەی سەرکەش !
لەسەر پەرەی باڵەکانمدا هەڵدەگرم
لە هەسکە مەرگی ئەستێرەی شەوانی زستاندا
کفن بۆ گەواڵە هەور دەبڕم
تا هەمیشە پەلکە زێڕینەی ووشە
ببن بە گیانی نەمری شیعرم.

■ ■ ■

- ماسی ئاسا بە ناخی قوڵاییی‌یەکاندا
دێە خوارێ
شەپۆلی هاری دەریا دەنۆشم
باوەشی شەختە بە ستووی کەنار جێ دەهێڵم
بە هەناسەیێ هەر چی سەرچاوەیە هەڵی دەنۆشم
بۆ قوورگی تێنووی شیعری تامەزرۆی مەستو وێلم
- لێزمەی باران ئاسا،
لە چاوی بێداری چاوە نواریدا
بە خوور دەبارم...
بۆ هەناوی بیابانی سۆزە تێنووەکان

تا هەرچی ڕەگی ووشك بووی ئەوینە
بکا چرۆ...
بۆ لق و پۆپی درەختی سەوزی ئەوینی تۆ

■ ■ ■

- دەبم بە ڕۆشنایی خۆرو هەڵدێم
تیشك دەڕژێنمە نێو کەلێنی تاریکی
دیوارەکان
تا هەرچی کاولگەی بیرەوەرییە
دیسان ببێ بە هەواری بە یەك گەیشتن
پڕ تیشك بێ چرای خامۆشی سەرە ڕێم

■ ■ ■

- لە توانەوەی نێو ئامێزدا
دەبم بە گۆرانی سەر لێوی سپێدەی
ماڵاوایی
ووشەی مرواریم دەکەمە ملوانکەی گەردن
پەیکەرت لە پشکۆی خوێنی هۆنراوە دادە ڕێژم
کە زانیشم مرۆڤایەتیت دەسوێتەوە
دەبێ بە بووکە شووشەی نێو جامخانەکان
هەرچی شیعرە، گۆرانییە، بیرەوەرییە
بۆی هەڵدەکەنم چاڵی مردن

# هیوا

# هەر لە دەشتایی

# دڵ ... دەڕوێ

سامیە محمد

١٩٨٠

دەشتەکان، ئەی ژانی دەشتەکان
ڕەنگ زەردن وەك منالەکان....
هەورێکی قیناوی سەرە دیقانێیان لە گەڵ دەکات
بەفر دەبارێنێ بەسەر چیای غەمیان
وەرزی ئەم بەهارە
بارێکی نا هەموارە
هات و نەهات بوو ـ بەسەرمانا تێپەر بوو
گرماندی...... لوراندی
نزامان کرد ـ نوێژمان بەست
ئەی دەشتی هەژاران
تۆش چاوەڕوانی بارانێ بووی
نەباری زەویمان شەقار بوو
لێوی منالان هەڵقوچا
شووم باڵی بەسەرمان کێشا
نەکەی بگرییێی ـ کۆرپەکەم نەکەی
هەوری سپی لە ئاسۆییکی دوور دیارە
بەرەو کێلگەی هیوا هێدی ـ هێدی

ڕێگا دەبڕێ....
تا نم. نم بکەوێتە دەم شەقاری زەوی
گەر بڕوا ناکەی.
تەماشای ئاسمانی ئاوسی هندرین‌و زمناکۆ بکە
ئەی دەشتی تینوو،
حەزەکانت بەهارە
ئاواتت بەهارەو
ژیانت بەهارەو
هەر ڕۆژێ دێ کە ببووژێتەوە
گوڵاڵەو نێرگزِ تیماری ژینی پڕ زامت بکەن
هەنسکی منالان...
وا بەناو تونێلی گوێما ڕەت دەبێ
دەزر نگێتەوە.... و
لە سەر پەرەی دڵما دەنیشتەوە
تەماشای فلیمی سەر ڕۆژنامەکان ناکەم
وا لەوێدا..... منالێك ڕەق بووە لە برسانا
وا لەوێدا..... دایکێك دەناڵێنێ‌و ئازادی
نابێ بە لوقمەی نانی
ئا لەوێدا.... مەلی سپی باڵ نەخشین بەندی ئاسمانێکی ژەقنە
ئا لەوێدا.... تێکۆشن بۆ تەنیا ماچی شۆخی ئازادی
منالان.....
دایکتان بەسۆزەو باوکتان هیلاکە
ئێوەش لە بەر سێبەری هەڵۆکان لە دایك دەبن
ئەی منالانی هەڵۆ،
خانوچکەتان تێك درا
تیشکی چرای قوتابخانەتان لەگەڵ تەرمی بەهارا نێژرا
خۆ دەستی باقە نەجمەی بکێش ماوە ؟
خۆ یەکەم پرسیاری برینمان هەتاوە ؟
ئێوە....
بە خەندەوە تەماشای رووی گرژی ناحەز دەکەن

گڕ بەر دەدەن لەخونچەی باخچەی ئاواتیان
شارەزان..
دەزانن بەرەو کام ئاسمان.
مەلی ڕەنگینو جوان دەفرێو
هێلانەیان لە سەر چ دارێ بۆ دروست دەکەین
دەزانن درەختی ئازادی چ دەگرێ
دەزانن، پێتان ووتم:
گەردوون....
منو گەردوون دوو دڵدارین
داوام لێ دەکا.
دار زەیتوونەکان پاراوکەم
لیوی شاخەکان بە بەفری بێ گەرد تەڕکەم
کێڵگە سووتێنراوەکان،
یەخەم دەگرن وەك دێوانە داوای نازدارانیان دەکەن
داوای بزەی دزراوی منداڵان دەکەن
داوای بارانی خوێن دەکەن
بەخوێنی شەهیدان شۆخە دەکەن
گیانە..
رازمان هەر بەهارە
نیازمان هەر بەهارە
بەهارەو بەهارەو
دەژیتەوە.
منالان...
چاوم لێتانە.... دلم ئاگاداری هەنگاوەکانتانە
ئاهەنگو تەپڵو زورنای زۆر دار
هەڵمان ناخەلەتێنێ.
جارێکی تر.
بالندەی بەهار بە ناو ئاسمان دووکەڵ نافڕێ
جارێکی تر....
دەگەرێیتەوەو
بەفری سپی چیاکان سرود دەخوێنێ

ئەم جارە...
بەهارە بەسەوزی دەڕێ و
مژدەی سەرکەوتن وەك گوڵ
بەسەرمانا دابەش دەکا
بەهار شین دەبێ
شین دەبێ
شین دەبێ
مژدەی سەرکەوتن لەگەڵ خۆی دێنێ..

---

تۆنێل - ژێرخاك - نفق
باقەنەجمە - ئەو ئامێرە کە رایدەکیشی بۆ ئەوەی گوللەبچێتە بەر عەمباری تفەنگ..

---

چاوی پڕ خوێنم دەگێڕم قیبلەکەم پەیدا نیە
نووری چاوم رۆیوە، یا دیدەکەم بینا نیە ؟

وەك نەیستان ئاوری بەر بوتێ دەروونم بەند بەبەند
دڵ کە هەر وەك نەی دەناڵێ دەم بەدەم بێ جانییە

ئەی چرا لەحظێك مودارا تیژ ببینێ رەنگەو رووت
وەرنە پەروانەی غەریب جانو دڵی پەروا نیە

بۆ نیثاری مەقدەمت عومریکە دەگریم رۆژو شەو
تا بەکەی گەوهەر فشانی ی چاوەکەم دەریا نیە ؟
«وەفایی»

چیرۆك

# رەش نووس و.. پاك نووسی (پێش برکێیەکی نوێ)

(م) بەلای خۆشییەوە لە (م)ەکەی دوێنێ نەدەچوو، چ جای بەلای ئەو خەلکەوە!. ئیمرۆکە وا دێتە بەرچاو دە پانزە سالێك بەرەودوا گەراییتەوەو، گەنج بوو بێتەوە!.

محمد رشید فتاح

ئاوەتا بە جۆریك خۆی لێ هەڵ گێراوەتەوە، دەڵێی چاوەروانی ئەوەیە.. هەرچی بەو شێوەیە بیبینێ، دەمو دەست باوەشی پیادا بکات و، تێرو پڕ ئەملاو لای ماچ بکات و، لە کەلێشیا بەو پەڕی شاگەشکەیی‌یەوە، رووی دەمی تێکات:

(ـ بە خوا هەر لە خۆت دێت.. کورە هەر خۆت تاکە سواری مەیدانیت !).

جارو بار کە ئەوەی بەبیردا دەهات، هێندێ لە کورو کاڵی ئەم رۆژە، زیرەکن و، سەر لە ناوکی زۆر شت دەردەکەن و، وەك ئەوەکانی دوێنێ نین چاو بەستیان لێ بکرێت و، بە هەموو دۆ عایەکیش بڵێن: ئامین: دەقی رووی دەژاکاو، دێراوی سەرو خواری تیا دەبینرا، بە خۆی دەوت:

(ـ هەر چی‌یەك دەڵێن.. با بڵێن..؟ خۆ پێش برکێکە بۆ هەموو کەس نیە بەشداری تێدا بکات !. کە لە پیاوی وەك ئێمەو مانان نەبێت، کەسی تر ناتوانێت بە پەرێزیشیا بڕوات !. کەواتە سەرکەوتن هەر بۆ ئێمەیەو، بڕایەوە، ئیتر با تا ئێوارە هەتیوو مەتیو هەر لە ورگی خۆیان بدەن !. هەزارانی وەك (مامە قالە) تا

کرد. ئەم مەسەلەیە لە سەر رۆشنایی باری تازەو گۆڕانی پەیمانی سیفردا چاوی لێ خشێنرا ولێی کۆڵدرایەوە لە سەر ئەوە بریار درا کە پێویستە کوردەکانی باشوور بە شێوەیێکی تایبەت بەڕێوە بچن. سێر پڕس کوکس روونی کردەوە کەوا ئەم لە پێشوشدا بە ئەنجومەنی وەزارەتی عیراقی راگەیاندووە کە بە پێی پەیمانی ناوبراو دا لە ماوەی سالێك ئەم خۆی کارو باری ناوچەکانی کورد دەگیرێت.

لە دووایی ئەم ماوەیەدا مەسەلەکە دیسان لە سەر رۆشنایی‌ی باری نۆی‌دا لێك دەدرێتەوە. کۆکس نامەی رەخنەی لە لایەن ئەنجومەنی وەزارەتەوە دژی ئەم سیاسەتە پێ گەیشتووە. ناوچەکانی کورد لە لایەن فەرمان بەر (متصروف) بەڕێووە دەچوون بە پێی راوێژکاری ئەفسەرە سیاسیەکانی ئینگلیز و بە فەرمانبەرایەتی موچەخۆرانی کوردەوە کاروباریان هەڵئەسوورێنرا. یەکێك لە متەسەریفەکان فەتاح پاشا بوو. سێر پڕس کۆکس لە سەر ئەو باوەڕە دا بوو کە ئەم ناوچانە بەشێکن لە عیراق، بەتایبەتی لە رووی ئابوریەوە. ئەم لە گەڵ خاتو مس بێل لەو باوەرە دان کە بەشێك لەم کوردانە ئامادەن لە هەڵبژاردنی گشتی‌دا بەشداری بکەن، بۆپێك هێنانی پەرلەمانی عیراق. بەلام ئەم گومانی خۆی دەربڕی دەر بارەی هەلسوێستی دانیشتوانی سولەیمانی لەم رووەوە، بەلام ئەم بە ئاواتی ئەوە بوو کە ئەمانیش ماوەیان هەبێت بۆکۆمەکی کردن لەم بارەیەوە.

مێجور یۆنگ ووتی کەواتە تا وەکو کاتی هەڵبژاردنەکە ماوەیێك پێویستە تاوەکو ئەمان [کورد] لە سەر هەستو بریارێك‌دا لەم رووەوە رێك بکەون. لەبەر ئەمە ئەم [یۆنگ] ووتی کەواتە پێویست بە چاوەڕوانی هەڵبژارون ناکات و هەر لە ئێستاوە فەرمانڕەوایی بە کوردان بدرێت کە راستەو خۆ لە ژێر دەسەلاتی مەندوبی سامی‌دا بەم جۆرە ناوچەکە سەربەخۆبەڕێووە بچێت.

لە وەلام دانەوەی پرسیارێك لە لایەن سەرۆك (چەرچل) میجۆر نوئێل ووتی خۆی لە سەر ئەم باوەڕە دایە کە کوردەکان سەربەخۆ بەڕێووە بچن، ئەگەرچی دوور نیە بە پێچەوانەی ئەم باوەڕە بریار بدرێت؛ لە هەمان کاتدا نوئیل ووتی پێویست بە دوو موتەسەریف ناکات لەم ناوچە کوردیانەدا، بەڵکو تەنیا یەك فەرمانبەر دابمەزرێت بۆ دوو ناوچەکە؛ ئەم بڕوای وابوو کە بریار بۆ ماوەی شەشل مانگێك دوا بخرێت، ئەوسا کوردەکان خۆیان لە سەر بەشدار بوون لە گەڵ عیراق‌دا بریار دەدەن. مێجۆر یۆنگ نیشانی‌دا کە دوور نیە ئەم کاتەی ئیستا باشتر بێت بۆ ئەوەی هەڵبژاردنێك لە ناوچە کوردیەکان پێك بێت بۆ ئەوەی

ئێستەش هەر ماون‌و، ملی خۆیان ئەشکێنن، کەنەك بە کوڵ، بگرە بە قەلاّن دۆشکانیش هەڵمان گرن !!).

بەم وتانەی ناوەوەی خۆی، شادی‌یەکی کت‌وپڕی دێراوەکانی دەم‌وچاوی ،وەوە، گرژی‌و مۆنیەکەشی وەك هەڵم بە ئاسماندا دەبرد.

هەر بەو خۆشی‌یەوە ئەو کاتە دەرگای ئۆتۆموبیلە نوێ‌یەکەی کردەوەو، پێی پێوەنا.. تا لە شەقامەکەی نزیکی ماڵی خۆشیانەوە ڕەت بوو، سەری دەسووڕاند، خواستی ئەوە بوو کەسانێك بەم شێوەیە بی بینن‌و، دەستی بۆ بەرزکەنەوەو، داوای سەرکەوتنی بۆ بکەن !.

کەسی بەدی نەکرد، ئەمەی پێ ناخۆش بوو.

(- خۆ سەرکەوتنی من لەم پێش برکێ‌یەدا قازانجی خەڵکی تیایە !. تاکەی ئەم خەڵکە هەست بەوەناکەن ؟!).

زیاتر پێی پێوەنا.. کە (مامە قالە) ی بە چاوکرد، هەر ئەوە نەبوو چاشنی کەڵەشێرە زلەکەی خۆیان یەك دووجار باڵ بەیەکدا بداو، ئەمجا پڕ بەدەنگی خۆی بقووقێنێ !.

مامە قالە ئەوە تۆی ؟!.

مامە قالە - خۆی واهاتە بەرچاو بەرخێکی ونبووەو، ئەوەتا وا کەوتە بەردەستی گورگێکی برسی !.. جا سەیری کە چۆن چۆنی کەلبە کانیت لێ گیر دەکات‌و، تێکت ئەهارێت ؟! بە لایەوە ئەمە ڕاستەو، خەیاڵ نیە.. ئەم بەرخەو، ئەویش گورگ !.

ویستی ڕابکات، خۆی دەرباز بکات، ها ڕاکە گورگەکە پەلاماری دایت !.

**- مامە قالە.. ئەوە بۆ وا بێ کەیفی ؟.. وەرە سەرکەوە !. دەرگاکەی پێشەوەی بۆ کردەوە.**

**- دە فەرموو !.**

مامە - بێدەنگ بوو، بەرد ئاسایی ڕەق بوو بوو..

(- بڵێم ئەوە منم.. بڵێم دیسان: ئێشت پێمە.. بڵێم من‌وتۆ کوجا مەرحەبا.. بڵێم تا ئێستەش بەدەم شەقی تۆوە ئەناڵم.. بڵێم ڕووت‌و ڕەجاڵێکی وەك منت بۆ چی‌یە ؟!.).

خێرا خێراش شریتی ئازارە کانی ڕۆژانی ڕابوردووی بە پێش چاویدا ڕادەبورد.

(- ئەو شریتانە.. داستانێکن.. داستانێکی نەمر.. جا تۆ بەلای خۆتەوە ناوی دەنێی چی ؟ ناوی بنێ.. کەیفی خۆتە !. داستانی ڕەش‌و سپی ناوە

ئەنێ ی، داستانی گا ئەیکاو، کەر ئەیخواتی ناو ئەنیٚ ی، ئەوە خۆت موخەیر بە !).

- **مامە سواربە ئیشم پێتە !.**

- **بە من ؟!. ئیشی چی ؟!.**

مامەدەمی کرایەوە.. (م) کەیف خۆش بوو..

- **یەکجاری وانا.. بێ قەزا بی، ئەڵێ ی تازە یەکتر ئەناسین !. دە وەرە سەرکەوە.**

- **ئاخر ئوتوموبیلەکەت پیس ئەکەم !.**

**(م) پێکەتی، (-ئوتوموبیلەکەم.).. قا.. قاپێکەنی،**

**(- ئوتوموبیل هی کێ یە؟.. بێگومان هی تۆیە!) (دەوەرە سەرکەوە.)**

**مامە قالە - سەرکەوت، بە بێ بڕواییەوە لێ ی دانیشت.**

**(- دەدانیشە مامە قالە.. هەموو کەس ئەزانێت.. نا سوێند مەخۆ، بروات پێدەکەین، ئەوە یەکەمجارە لە ژیانتا پێ بخەیتە ئەم جۆرە ئوتوموبیلانەوە!.**

**بە خوا ناوی مۆدیلەکەشی نازانی.. جارێ بەم زوانەش هەر فێر نابیت !.**

- **مامە قالە.. ئیمڕۆ پێش برکێ کەیە !.**

- **قوربان ئەزانم.. منیش بۆ وێ ئەچم.**

- **تۆ بلێ ی سەرکەوم ؟!.**

(- یعنی نازانی مەلعوون.. سەرو بنی مەسەلەکەت لەکن روونە، وام تێ ئەگە ی گەلحۆوگەمژەکە ی جارانم.. نیازت وایە ئەمجارەش لە خشتەم بەری، ها جەنابی (م) ئەفەنی !. ئەوە نیە هەر لە ئێستەوە خۆت بۆ حازر کردوە.. ئەوەتا پانتۆڵی کورتت لێ هەڵکێشاوە !.. وەڵلا ئەڵێ ی لاوێکەو تازە سەر هەڵئەدات. کورە تۆ مسۆگەری !. تا کەسانی وەك من هەبن، تۆ هەر سەرکەوتوویت !.. لە پێش برکێ کە ی ئەو ساڵی دا بەکۆڵی من، سەرکەوتنت بە دەست هێنا.. تۆ خەڵاتی خۆت وەرگرت و، منیش مایە پووچ مامەوە !.

کورە مامە قالە - ئاگات لە خۆت بێت.. پێش برکێ کە ی ئەمجار (راکردنە)، (م) بەم گەڵ و گیپاڵەوە، ناتوانێت رابکات.. ئەیەوێت دیسانەوە تۆ بیکەیتەوە کۆڵ !. هوشیار بە.. نەکە ی !.

کورە ئاگام لە خۆمە.. ئەو ژەمانە زیلۆخ.. تازە !.)

- **مامە.. لەگەڵ نوێژەکانتا لە چی دایت ؟.**

- **بەردەوامم.**

**- هەر ئەوەمان بۆ ئەمێنێتەوە !.**

**- بەڵێ..**

**- مامە ئەی لە گەڵ ئیش و کاردا ؟.**

**- خوا پەك ناخات.**

**- لە سبەینێوە خۆت و - حەلاوە - لای من ئیش بکەن.**

**- خوا دەست بە عومرتەوە بگرێت !.**

(- ئەوە لە کەیەوە ئەم (م)ە، وا گۆڕاوە ؟.. نازانم.. خەریکە بڕوا ئەکەم، بڕواش ناکەم.. شەرتبێ گومان لە لام ئەلێی.. ئەژدیهایەکەو، خەریکە هەڵم ئەلووشێ !.

بە چی دامان ئەمەزرێنێ ؟.. ئەی پار نەیوت:

(- ئیشی ئێوەمان نیە، کرێکاری شارەزمان پێویستە !. ئێ لەوانەشە بە بەر دەستێك دامان مەزرێنێ !.. تۆ بڵێی بەراستی بێت ؟!.).

**- مامە قالە - ئەبێ برای دینی بە کەڵکی یەکتر بێن !.**

**- جاکوا ؟!.**

**- من بە کەڵکت دێم، چاوم لێتە.. تۆش بەکەڵکم دێیت !.**

**- لە چ ڕوویەکەوە بەکەڵکت بێم ؟!.**

**- لەم پێش برکێیەدا، فریامکەوە خۆت ئەزانی کەڵکی ئەوەم پێوە نیە دە مەتریش ڕاکەم !.**

**- جا قوربان بۆ بەشداری ئەکەیت ؟.**

(م) ئەبلەق بوو..

(- لەوە ئەچێت مامە قالە شتێك فێر بووبێت !. ئەشێ دەستێکیان لە مێشکی وەردابێت.. ئەگینا ئەوو ئەم جۆرە پرسیارانە ؟!.

ئەی مامە قالە - خۆ تۆ بەشداری ناکەیت ؟.. ناشێ نیازی ئەوەت هەبێ بەشداری بکەیت.. بەخوا جوانە.. من بەشداری هەموو پێش برکێیەکم کردووە، گەر پێش برکێی (جۆد)و، (بۆ کسێنیش) بێت، ئەوا ملی خۆمی بۆ ئەشکێنم !. نانێك هەبێت لەوە دایە !. کە چی ئەم زرتە بۆزە پێم ئەلێ: بۆ بەشداری ئەکەیت ؟.

ئێستە گرنگ ئەوەیە قایلی بکەم، بە کۆڵی ئەوەوە ئەنجامێکی باش بە دەست بێنم !).

- من بەشداری بکەم.. لە یەکێکی تر چاترە !.
- بۆ ؟.
- چونکە لەوە گەیشتووم.. کە دنیا گۆراوەو، ئیمڕۆ دوێنێ نیە.. گەر یەکێك هەبێ بمکاتە کۆل، ئەوا وەك برا خەڵاتەکەی لە گەڵدا ئەکەم بە دوو کەرتەوە !.
(- تۆبڵێی (م) بەراستی بێت ؟.. تۆ بڵێی گۆڕابێت ؟. ڕێی تێ ئەچێت.. خۆ ئەویش گانیە هەر لە پێستێکدا بمێنێتەوە !.. سەیری سەروزمانی کە.. چەند خۆشە؟. ئەبێ بەراستی بێت.. چی تیایە مامە قالە - ئەمجارەش بچۆرەوە ژێر بار، ئەوا خۆت و، حەلاویش، دائەمەزرێن و، نیوەی خەلاتەکەی ئەم پێش برکێیە وەر ئەگریت !.).

- قوربان من یارمەتیت ئەدەم.
- (م) گەشایەوە.
- هەر زوو ئەمزانی تۆ دڵسۆزەکەی جارانمی !.

* * *

شنار خرۆشا بوو، کۆمەڵێك بە جلی رەنگاو رەنگەوە، بەدورو درێژی شەقامەکە بەرانبەر بە یەك وەستا بوون، هەر یەکەشیان فیت فیتەیەکی لەملدا بوو، بەشداربووەکانیش هەریەکەو، ئەوەکەی کەبەکرێ گرتبوو، لە ناوەندی گۆرەپانەکەدا. ریز بوبوون.
مامە قالە - سەرسام بوو، بەهەر چوار لادا چاوی گێڕا.. بیری ئاڵۆزی لە سەر شتێك نەدەگیرسایەوە. ئەمەی بەخۆی دەوت:
(- ئەوە خۆ بەشدار بووەکان، وەك (م) کەسانی تریان بەگیر هێناوە ؟!.
دیارە ئەوانیش چەشتی (م) قاچ و قولی راکردنیان نەماوە !.
بڕوانە.. هەندێك لەوانە هەر بۆ هەلپەراندن باشن !.سەیری گەڵ و گیپالیان کە.. توخوا ئەوانەو ئەم جۆرە پێش برکێیەیان وتووە ؟.
ئەوە بەراست ئێمەو مانان بۆ بەشداری ئەم جۆرە پێش برکێیانە ئەکەین ؟.. ئۆی.. مامە قالە - ئەوە نیە بەشداری ئەکەیت ؟. ئەی (م) نەیوت: پێکەوە بەشداری ئەکەین.. تۆ کەرو من کورتان !!.
ئەوە نیە کە سانی وەك من بەشداری ئەکەن.. هەمووشمان بە تەمای نیوە خەڵاتین !).
یا لە خۆی دەپرسی:
(- تۆبڵێی - ئەمجارەش (م) دەستم نەبرێت ؟!.

خۆ گەر وابێت.. ئەوە وا چاکە سەری لووتی خۆم رەش کەمو سەری خۆم هەڵگرم.

چونکە هەرکەسەکانی خۆم پێم ئەڵێن:- خەڵکی چەند ساڵە.. بەنێو لاپەرەکانی ئەم داستانانەدا تەراتێن ئەکەن.. کەچی شتێکیش لێوە فێر نابن !!..).

فووکرا بە شاوردا، بەشداربووەکان هەریەکەیان لە وەکەی خۆی خوری:

- ئادەی بەقوربانە.. چۆك دادە.. بابێمە کوڵت !.

مامە قالە - چۆکی دادا.. (م) خۆیدا بە کۆڵی ئەودا، مامە قالە - تاراست بوەوە سەرو چاوی ترش و تاڵ بوو. گازەرای پشستیشی زریکەی لێ هەستا.

گوری دایە خۆی.. یەك دوویەکی پێش کەوت، زۆریشی لە دواوە بوو.

(م)ش هاواری لێدەکرد.

- دەی بە قوربانە.. نیوەی خەڵاتەکە حەڵاڵ کە..

ئەزانم تۆ پیاوێکی وانیت حەرام بخۆیت !.

مامە قالەش.. چین، چین، ئارەقەی شینو مۆری لێ دەچۆڕا.. وردە، وردەش، خەریك بوو تینوویێتی پرزەی لێ ببڕێت.

(م) مەتارەیەکی بە دەستەوە بوو، وەکو هەست بەماندوێتی بکات، قرپێکی لە ئاوی مەتارەکە ئەدا. مامە قالە هاواری کرد:

- قوربان.. ئاو..

- کورە ئەوە بەراستە ؟.. ئاو خراپە.. زۆری نەماوە.. نامەوێ تووشی سك یەشەبێت.. ئەها.. ئەو خەڵکە چۆن هانت ئەدەن.. دەی خێراکە !.

- ئەی پاروویەك نان.. برسیمە.

- لە سك یەشە ناترسی.. دیارە تۆ ناتەوێ پێش کە وین !.

مامە قالە - خەریك بوو ئەژنۆی بشکێت.. چاوی بڕیبووە ئەوسەری شەقامەکە. تینووێتیو، برسێتی.. ژانیان خستبووە ناخیەوە.

هێندێك لە بەکرێ گیراوەکان، توانایان نەما، کەوتنو، بەشداربووەکانیان بە دەماخستو، خۆشیان لە سەر رشەقامەکە لێی درێژ بو بوون. ئەوانەی کە مابوونەوە بە سەرپشتی ئەواندا رایان دەکرد !. (م) دڵخۆشی مامە قالەی دەدایەوە:

- خۆم چاکم ناسیویت.. هەر کورە چاپووکەکەی جارانیت !.. تا سەر کەوتنی کۆتایی ناوەستیت !!.

**مامە قالە ـ بەچۆکدا هات.. (م)ش، لە پەورووو کەوتە سەر شەقامەکەو، هاواری لێ هەستا..**

**ـ دەك ماڵت وێران بێت، وەك ماڵت وێران کردم !. ئێستا من چی بکەم ؟.**

مامە قالە.. لە حەوت ساڵان ڕاست بووەوەو، دوا هەناسەی لێ بڕا.

(م) پشتی تێکردو، کەوتە خۆی.. زۆری نەبرد.. یەکێ لە چاو دێرەکان، لێی نزیك کەوتەوەو، چرپانی بە گوێیدا.

**ـ قوربان ئێوە هەر سەرکەوتوون.. خەلاتەکەش هەر بۆ ئێوەیە !!.**

# «تەڵە»

اسماعیل رسول

**كە گەیشتە ڕێگا خۆڵاویەكەی تەنیشت بێستانە دار خورما چڕەكە تاریكایێكی رەش‌و سامناك هەموو لایەكی لوول دەدا، تا ئەو رادەیەی بێستانەكە وەكو مێردەزمەییێكی زەبەللاح، دەهاتە بەرچاو.**

بە هەنگاوی خێرا دەبەزیی، ترسێیك لە ناخی دەروونیدا جێیگر دەبوو. لە وەتەی هاتۆتە ئەم شوێنە، دبوو هەموو رۆژێ بە چوون‌و هاتنەوە، ئەم ڕێگایەبكوتێتەوە. بەلام هەمیشە ئاگاداری ئەوە بوو كە تاپێی بكرێ، درەنگ نەگەڕێتەوە، تا تووشی هیچ گرفتێ نەبێ.. ئەوا جاری یەكەمەدوا دەكەوێ كش وماتیی هەموو لایەكی داگرتبوو، هەواش كپ راوەستا بوو، هەتا دارخورماكانیش چلە دارەكانی وەك دەست‌و بازوویەكی بێ جووڵەی مێردەزمەییێكی ترسناك، بۆی

دریژ کرا بوو. که ئاورِی له لای راستەی دایەوه کۆلێته له حەسیـر درووست کراوەکانوا پیّ دەچوو که هیچ جۆره گیانداریّکی تیّدا نەبیّ. چاوی به تروسکه رووناکینەکیش نەکەوت، تیایاندا بیّته دەریّ. هەستی پیّکرد تـرپه دلّی بـەرز دەبیّتەوه، تاریکایی وەکو دیّویّکی ترسناك به دوایـدا دەکەوت. دەیـەها بیـری راگوزاری له میّشکیدا بروسکەی دەداو لۆمەی خۆی دەکرد: «نه دەبوایه بەم شەوه درەنگه بیّرەدا بڕۆیشتمایه ؟!». بەلاّم ناچار بوو ئـازایەتی بـداته بـەره خۆیو ترسەکەی هیّمن بکاتەوەو خەیالّو بیره راگوزاریه کانی ناو میّشکی لغاو بکا.

هیّندەی نەمانیوەی ریّگاکه ببڕیّ بەخـەیالّی نـزیك بـوونەوەی مـالّەوەی دلّخۆشی دایگرت.. ئەوه مالّه کەی چەند شەقاویّك لیّ‌ی دووره.

لەحەپەی سەگیّك راچلّەکیی. تەپه تەپیّ له دوایدا دەهات، له سەرەتادا هەنگاوه کانی هەندیّ سست کردەوه، بـەلاّم هیچ ئـاوڕیّکی نەدایـەوه، لەگەلّ خۆیدا بیری کردەوه: «ئەوانیش وەکو من بۆ مالّ دەگەڕیّنەوه، بەلاّم دەنگی تەپه تەپەکه توندو بەرزتر دەبۆوه، که ئاوڕی دایه دواوه، سیّ‌تارمایی هاته بەر چاو، بەخیّراییّ به دوایدا دەرۆیشتن. دوو باره تاوی دایه وه بەر خۆی، ویستی لیّیان دوور بکەویّتەوه، بەلاّم دایانـه بەزین، کـەلەّی نزیـك بوونـەوه به یـەك دەنگ قیڕاندیان:ـ کابرا بوەسته.

گویّی نەدانیّ، هەنگاوەکانی خیّرا ترکرد. هەستی کرد تەزوویەکی سارد هەر له تۆقی سەریەوه تا دەگاته پاژنەی پیّی‌ی پیّیدا دەڕوا هەر دوو چوکەکانی کەوتنه لەرزینو هیّندەی نەمان پەکی‌یخاو له جوولەی راگریّ. بەلاّم هیّـزیّکی نهیّنی‌ی پالّی پیّوەناوله رۆیشتندا بەردەوام بوو. له خۆی پرسیی: «دەبیّ چییان له من بویّ ؟!».

بەلاّم چریکەیّکی تیژ، تۆقینی پرژاندە ناو تاریکایی یەکه:

ـ پیّت دەلیّن بوەسته وەیا..

ئاوڕیّکی دایەوه دواوه، دیار بوو هەر سیّکیان به دوایدا دەبـەزین. تیشکی لایتیّکی دەست، دەمو چاوی رووناك کردەوه ناچار رەق وەستا. دەورەیان لیّدا. هەستی به ئازاری تویزیّك کرد رمبەی له پشت ملیەوه هیّنا: «ئا.. وەکو مشکیّکی تۆقیو کەوتیه ژیّر دەستمان». دووەمیان گوتی:ـ «ئەوه چی تۆی بەم شەوه زەنگه هیّنایه ئیّره ؟!». سیّ‌یەمیان گوتی:ـ «.. دیـاره بۆ دزین هـاتوی.. وا نییـه ؟!». ویستی بەرەنگاریان بیّتەوه، بەلاّم توند گرتیانو ویستیان پەلکیّش بکەن:

- با بۆ پۆلیسخانەی ببەین.
- بۆ ؟!.. چیم دەر حەق ئێوە کردووە ؟!
- نازانی بۆ ؟.. ئەی لە پشت ئەو دەرگایە خۆت مەلاس نەدابوو ؟ .. چاوەروانی هەلێکت دەکرد دزیمان لێ بکەی.
- بەو خوایە ئێوە بە هەڵەداچوون:-
- سوێند مەخۆ، ئێمە بەچاوی خۆمان دی .. دەمێکە چاوە دێریت دەکەین.

بە حەپەساوی یەوە لە دەمو چاوە د مامك کراوەکانیان راما، هیچی لە ئەدگارەکانیان بەدی نەکرد. ئەم دەنگە لە گوێی زرنگەی دەدایەوە:

«با بۆ پۆلیسخانەی ببەن». لە دڵی خویدا بڕوای بەو تومەتی دزی کردنەی دەیانەوی پێیەوەی بلکێنن نە دەکرد:

..« تەڵەییکە دەیانەوەێ بمخەنە ناو یەوە»

چەند بیرێك وەك برووسکە بەمێشکیدا تێپەری: «دەبێ راست بکەن کە ماوەییکە چاوە دێریم دەکەن ؟!.. تۆ بڵێی پاش دەرچوونم لە کۆبوونەوەکەدا بەدوام نەکەوتبن ؟!».

«بەلاّم سەرو سیما یان لەوان ناکا، خۆ ئەگەر ئەوان بانایە بە جۆرێکی دیکە رەوشتیان لەگەڵ دەکردم.. نا.. نا ئەوان نین ؟.. تۆ بڵێی ریگر نەبن، ئەم شانۆگەرییە رێك دەخەن، بۆ ئەوەی رووتم بکەنەوە بەلاّم من چیم پێیە ؟.. نیو دیناری سعاتە کۆنەکەی دەستم، کە بە هیچ ناچێ.. دەبا ببیەن.» هەوڵیدا پێیان بسەلمێنی کە دز نییە، بەلاّم پارانەوەکانی هیچ کەڵکی نەبوو. توقین دای گرت، ئەوان سوور بوون لە سەر ئەوەی، کە دەبێ بەگەڵیان بکەوێ. دیسان کەوتەوە بیرکردنەوە: «دەبێ مەبەستیان چی بێ ؟!.. چۆن دەلێن لە پشت دەرگاکە منیان دیوە، منیش کە چاوم بەوان کەوتووە تێم تەقاندووە.. ئای لەو نەفرەت لێکراوانە، چۆن درۆییکە هەڵی دەبەستن ؟!».

یەکێکیان، کۆڵە مستێکی بەسەر سەریدا داداو قیراندی:

- ئەگەر بەگەڵمان نەکەوی، پارچە پارچەت دەکەین و لە چاڵێکی ئەم بێستانەدا گۆرت دەکەین.. تێ دەگەی ؟

بەلاّم ئەو هەر دوو قاچەکانی لەزەوی‌دا چەسپاندو گوێی نەدایە هەرەشەو گورەشەیان. دیسان کەوتەوە بیر کردنەوە: «باشە ئەگەر هاتو راستیان کردو منیان بردە پۆلیسخانە چییان پێ بڵێم ؟.. چۆن تومەتەکەیان رەت بکەمەوەو بەدرۆیان بخەمەوە ؟.. خۆ شایەدی سێ کەس بەسە پێی تاوانبار بکرێم ؟.. ئای لەم بەد بەختییەی ئەم شەوە دوو چاری هاتم ؟».

.. دیار بوو بیرێکی لە ناخی دەروونیەوە پەسند کردو:

«.. هیچ ڕێگایەکی دیکەم لە بەر دەمدا نییە».. بە دەنگێکی بەرزەوە دایە هاوارو چریکاندن. لە پڕ جموجوڵ کەوتە ناو کوڵێتەکان، تروسکە کزەکەی فانۆسەکانیان شەوقی دایەوە.. پیاوەکانیان دەرچوون خەڵکێکی زۆریش لە ژن و منداڵ بە دوایاندا هاتن، هێندێکیان فانۆسیان بەدەستەوە بوو. دەورەیان لێدان، سەر سوورمان نەخشەی بەسەر روخساریاندا کێشا بوو. پرسییان:

- ئەوە چی یە ؟!.

سێ زەلامەکە وەڵامیان دایەوە:

- ئەوە دزە گرتوومانەو لە پشت دەرگایماڵمان خۆی مەڵاس دابوو.

- بڕوایان پێ مەکەن.. من هەر ڕێبوارێکم و بەس.

- چی ی تۆی هێنایە ئێرە ؟

- من میوانی دۆستێکم، ماڵیان لە خانووە تازەکانی کرێکارانە .

- بەدەست نیشانەی دانێ -.. لە کوڵێتە کانی ئێوەوە نزیکە..

ئەوا لە کۆتایی ئەم ڕێگایەیە.. تکاتان لێ دەکەم چۆن میوان ئەم جۆرە رەوشتەی لەگەڵ دەکرێ ؟!.

ژنێك لە دوورەوە بە غاردان دەهات. کە نزیك کەوتەوە چریکاندی:

- ئا ئەوەیە دزەکە، بە چاوی خۆم دیم لە پەنا دەرگاکە خۆی مات کردبوو.

- خوا بتگرێ ژنە، چۆن ئەو درۆیە ڕێکدەخەی، لەم شەوە زەنگە چۆن منت ناسییەوە.. خەڵکینە بڕوای پێمەکەن من لەم ڕێگا خۆڵاویە بستێك لام نەداوە.

پیاوێك لێی نزیك بۆوەو دەمی بۆن کردوگوتی:

- وام دەزانی سەر خۆشەو ڕێی بزر کردووە، بەڵام دیارە وا نی یە.

تێیان ڕاما، لەبەر ڕووناکی تیشکە کزەکانی فانۆسەکان دەم و چاوەکانیانی دەبشکنیەوەو دەیەویست بزانێ چی تێدا نووسراوەو بڕوایی ڕاستەقینەی ناخی دڵییان بەرامبەری چی یە ؟!.

ورتە ورتی خەڵکەکە بەرز دەبۆوەو دەمە تەقێیان گەرمدەبوو، هەر یەکە بە جۆرێ ڕای دەر دەبریی، بەڵام زوربەیان بڕوایان نەدەکرد کە دز بێ.. کابرا ئازایەتی دایە بەرە خۆی و پرتەییکی کرد.. «دەبێ لەم تەڵەیە بێمە دەر». لە پڕ خۆی ڕاپسکاند قاتەکەی بەری ڕێك و پێك کردەوە، چەند قسەیەکی جوان و کاریگەری ئاراستەی خەڵکەکە کرد، ویستی تێیان بگەیێنی کە نەوەك لەم تۆمەتە بەدەی ئاراستەی دەکەن دوورە، بەڵکو ئەو پیاوێکی رەوشت بەرزو ڕۆشنبیریشەو بە دەنگێکی بەرزەوە هاواری کرد: بۆ شوورە بیە بۆتان.

ئەنجومەنێکی تایبەتی بۆ ناوچەی خۆیان هەڵبژێرن. ئەم هەمیشە لەم باوەڕە دابوو کە پێویستت بە هێزی بێگانە ناکات بەڵکو هێزێك لە ناوچەی کورد خۆیاندا دەتوانی یاساو هێمنی راگرێت، و بپارێزێت.

سەرۆکی لێژنە هەمیشە لە گەڵ پێشنیاری مێجۆر یۆنگ دابووو رای خۆی دەربڕی کەوا دەکرێت یارمەتی دارایی سەرۆکێکی کورد بدرێت لە گەڵ فەرمانبەری تردا وە پەیوەندی بازرگانی رێك بخرێت بە شێوەییك کەوا تورکەکان ماوەیان نەبێت لەم وولاتەدا دژی پەرژەوەندیەکانی بەریتانیا بوەستن. ئەم ووتی هاتوو کوردەکان خۆ بەخۆیی بەڕێوە نەچن نا هەمواری بەر پا دەبێت. میرێکی شەریفی (لە نەوەی شەریف جوسین)، ئەگەر چی لە رواڵەتدا خۆ بە دیمکراتی نیشان بدات بەلام بە پێی تواناو هێز دوور نیە هەستو ئاواتی کوردەکان باش گوێ بخاتو بەرهەڵستی داخوازیەکانی گەلە کەمایەتیەکی وەکو گەلی کورد بکات. کە چی بۆ سیاسەتی بەریتانیا باشترە حکومەتێکی پێش برکە (BUFFER)ی کورد لە نێو عیراقو ترکیادا دامەزرێنرێت.

سێر پرسی کۆکس ووتی دەسکەوتی دارایی ناوچەکانی کورد لەمە کەمترە کە خەرجی ئیدارەی ناوچەکەی پێ یررێت. وە مێجۆر یۆنگ ووتی کەواتە باشترە ئەم ناوچانە سەر بەخۆ بەڕێوە بچن. بەلام کۆکس ووتی لە گەڵ سەر بەخۆبەڕێوە بردنی ناوچەکە ماوەش بدرێت بەو رووداوانەی کە بەرەو تێکەڵ بوون لە دوواییدا لە گەڵ عیراقدا ئەڕوَن.

لە سەر پرسیارێك لە سەرۆکەوە (چەرچل) مێجور نۆئیل لە وەلامدا ووتی بەمەزەندە باشترین تخوب لە نیواندا ئەوەیە کە لە خواروی گردولگاندا تێپەر دەبێت. هەر وەها ئەمیش پرسی لە سەر ئەوەی دەربارەی ئامیدی شتێك روون بووتەوە یانا لە رۆشنایی باری نوێی پەیمانی سیفردا.

سەرۆکی لێژنە روونی کردەوە کە جۆرە لەیێك چوونیك لەنیو پێوەندی خواروی ئەفریقاو رودیسیاو پەیوەندی ئەم دوو ولاتەدا هەیە. ئەم ئەم باوەڕەی خۆی دەربڕی کەوا پێویستە سیاسەتی بەریتانیا ئاواتو ئامانجی گەلی کورد پشت گوێ نەخات، بەڵکو دەبێ لە بەرچاو بن. هەر وەها ئەم ووتی هەر دوو وولات پێویستە بە دوو شێوەی جیاواز بەڕێوە برۆن، بەلام بەرە بەرە لەیێك نزیك تر ببنەوە. سەرۆك وەکو مێجۆر یۆنگ لەسەر ئەو باوەڕە دابوو کە لە تواناد هەیە هێزێکی کورد بۆ سنور پێك بێت لە ژێر فەرمانی ئەفسەرانی ئینگلیز.

له پڕ پیاوێکی ریش سپی له ناو خەڵکەکەوە هاتە دەرێ بە توورەیی یەوە سەرنجێکی دایە هەموان و گوتی:
- خەڵکینە گوێم لێبگرن.. چۆن بڕوا دەکەن ئەفەندی یەکی وا قسە زان و ڕێك و پێك دز بێ ؟!. پێم ناڵێن ئێوەهیتان لە ماڵدا هەیە تا ئەم کابرایە بیی دزێ ؟!.
راست دەکا، شوورەییە بۆتان ئەگەر بێتو تووشی هیچ شتێ ببێ ؟!.
ئەم قسانە خەڵکەکەی هێنایە هەژان و چەند کەسێکی دیکە ئەم کارە بەدەی ئەوانەیان پەسند نەکرد، لەگەڵ سێ کەسەکە کردیانە چەقە چەق. ژنەکانیش هاتنە پێشەوە و داوایان لە پیاوەکان دەکرد ئەم کابرایە بەرەڵلا بکرێ. لە پڕ پیاوەکان چریکاندیان:
- وازی لێبێنن.. بەرەڵلای کەن، نەخۆ چی خراپە ئەوەتان پێ دەکەین..
ترس سێ کەسەکەی داگرت، دەمو چاویان زەرد هەڵگەڕاو، کشانە دواوە. ئەویش هەناسەییکی قووڵی هەڵکێشاو نیشانەی ترس و شڵەژاوی لە سەر روخساریدا نەما.

پیرە ژنێك بە پەلە جامە ئاوێکی بۆ هێناو لە دەستی وەرگرت و تینوانی خۆی پێ دامرکاندو بە رۆخی زمانەکانی لێوەکانی سڕی یەوە، سەیرێکی هەموانی کردو ووتی:
- سوپاسی یارمەتیتان دەکەم.
هێندەی پێ نەچوو خەڵکەکە بڵاوەی لێ کردو، ئەویش بە خێرایی ملی ڕێگای گرت و لە گەڵ خۆیدا دەی گوت «ئەوا منم لەم تەڵەیە دەرباز بووم ؟!».

- ٢ -

کە گەیشتە جێ، خانە خوێیەکەی کە کرێکارێکی نەوت بوو، لە حەوشەی ماڵەکەیدا چاوەڕوانی دەکرد، ژن و سێ منداڵەکانی لە ژوورەکەیاندا لە پرخەی خەوێکی خۆشدا جێی هێشت بوون.
- لە بەر تۆ زۆر شێوام نەمتوانی بنووم.. بۆ وا دوا کەوتی ؟!.
هێشتا هەر تاساوی رووداوەکە بوو، بەڵام کە چاوی بە روخساری برادەرەکەی کەوت هێشتا سەرنجی دەداتێ، بەزەردەخەنەیەکی کزەوە گوتی:

- رووداوێکی سەیر بوو، بە عاجباتی رزگارم بوو برادەرەکەی لێی نزیک بۆوە وبەسەر سوورمانەوە لێی پرسیی:

- رووداوەکە چی بوو ؟!.

بەسەر هاتەکەی بۆ گێرایەوە، پاشان داوای لە برادەرەکەی کرد، کە سبەینی ژنەکەی بنیرێتە ناوچەی رووداوەکە بەڵکو راستی رووداوەکە بە تەواوی بزانێ، با

- من حیکایەتی دزی‌یەکە ناچێتە مێشکم.. بەڵام مەبەستیان چی‌بوو، ئەوەیە دەمەوێ بیزانم ؟

بۆ بەیانی ژنە چووە جێگای رووداوەکە، لەم‌و ئەوی پرسیی - پیرژنەکەی ژێر سێبەری دار خورما زەبەللاحەکە کە سەوزەی دەفرۆشت گوتی:

- ئای کە لاوێکی شۆخ و شەنگ‌و قسە خۆش بوو، بەڵام ئەگەر خەڵکەکە نەبوایە بە بێ سێ‌و دوو دەیان کوشت‌و لاشەکەیان لە چاڵێکدا دەشاردەوە.

- پلە، نەتزانی چییان لێ دەویست ؟!.

- دەیان گوت دزە.. بەڵام دزی چی‌و حاڵی چی. ئەوە سێیەمین کەسە، رێی پێدەگرن. کورتەی حیکایەتەکە ئەوەیە: ئەوانە کچێکیی لادێیان رفاندووە، وا دەر دەکەوی شکیان لە یەکێکە کچی‌ی خۆش دەوی‌و پەیوەندی لە گەڵدا هەیە، بەڵام ئەو کەسە بەتەواوی نا ناسن، ئەوەندە دەزانن ئەفندی‌یەکی جحێلە، جا هەر یەکی لە دانیشتووی ئەم ناوچەیە ئەبی‌و لێرە هاتوچۆ بکا گومانی لێدەکەن.. ئا ئەوەیە راستی مەسەلەکە ژنە هاتەوە مێردو برادەرکەی بە حەپەساوی گوێیان دایێ. پاش چەند رۆژێ برادەرە کرێکارەکانی توانیان ئەم سێ کەسە بناسن، دەرچو براو خزمی یەکترن لە گەراجێکی ئوتومبێل چاکردندا کار دەکەن، ئەوە رۆژێك چوونە سەریان‌و بە بوکس شەق‌و شەقازڵلە دایانە بەر یەکێیان بە سەریاندا دەی قیژاند:

- چۆن دەتانەوێ بیکوژن ئەی بێشە رمینە؟! دەزانن ئەوە کێ‌یە ؟!.. ئەوە یەکێکە لەوانەی ژیانی لە پێناوی ئێوەدا تەرخان کردووە.. شوورەیی داتان ناگرێ، لەو کارە بەدەی کردووتانە ؟!.. ئێوە هەر بۆ ئەوە باشن بەتف دەموچاوتان سواغ بدرێ.

کانونی یەکەمی ١٩٨٤

●

# سبەینێ ڕۆژێکی ترە

□ فیلادیمیر کیلمۆفیچ □

□ و. محمد زەهاوي □

ئیتر فرە درەنگە. سبەینێ ئەبم بە بەختەوەرترین مرۆڤی سەر ڕووی زەوی، سبەینێ جوانترین و ناسکترین و زیرەکترین و هەڵکەوتوو ترین کچی جیهان دەبێتە هاوسەرم، ئەوەندە خۆشم ئەوێ کە هەمیشە لە بیرو هۆشمدایە.

ئێمە هەردوو ژن و پیاوێکی نموونەیین. من هەوڵ و کۆششی بێ پایانی خۆم ئەدەم: سەتڵی زبڵ ئەبەمە دەرەوە، جل و بەرگی خۆم دەشۆم و ئوتووشی دەکەم، گوڵیشی بۆ ئەکڕم، بەیناو بەینیش کە ئارەزووی جگەرە کێشان ئەکەم ئەچمە موبەق و جگەرەکەم لەوێ دەکێشم. ئێمە لە ڕاستیدا ڕێزی یەکتر دەگرین. پێکەوە دەچینە سینەما. قاپ و قاچاخ بە نۆرە دەشۆین. ئێمە لە سەرەتاوە دەربارەی هەموو شت پێك هاتوین.

ئەبێ سوپاسی **(کوکوشکین)** بکەم، ئەگەر ئەو نەبوایە، قەت ئەم شاییەم سبەینێ بەچاوی خۆم نەئەدی، لەگەڵ ئەم کەم ڕوویی و شەرمینەی من هەمە، هەرگیز بیرم لەوە نەکردۆتەوە کە لە گەڵ کچێکدا ئاشنایی پەیدا کەم.

کوکوشکین داهێنەرێکی گەورەیە. کە پێکەوە لە باخچەکە پیاسەمان دەکرد، ئارەزووی ئەوەم بوو سڵاو لە یەکێك لەو کچە جوانانە بکەم کە پۆل پۆل بە لاماندا تێ ئەپەڕین، لەو کاتەدا کوکوشکین سەر گەرمی تاشینی دارێك بوو، یان پارچە تەلێکی ئەڵقە ئەڵقە ئەکرد.

ڕۆژێ کوکوشکین هاتە لام و داهێنانەکەی پیشان دام. شتێك بوو وەك سنووق و دوگمەیەکیش بە دەرگاکەیەوە بوو. کوکوشکین هاواری کرد: «**گریشنا** هیچ نیگەران مەبە ! ئەم سنووقە بچووکە یارمەتیت ئەدا بۆئەوەی لەگەڵ کچێکی شۆخ و شەنگائاشنا بیت. وەرە بڕۆین بۆ سەیران، هەرکە گەیشتینە لای ئەو کچەی کە بەدڵتە، بەبێ ترسی و شەرمەوە نزیکی بەرەوەو پەنجەش لە سەر دووگمەی سنووقەکە دانێ ئامێرەکە ئیش ئەکا، کچەکەش ئاگادار ئەبێت کە تۆ چ لاوێکی هەڵکەوتووی، ناوو ژمارەی تەلەفوونی خۆیت ئەداتێ».

له خۆشیا سه‌رو قاچی خۆم لێك نه‌ئه‌كرده‌وه‌، كوكوشكێن سنـووقه‌كـه‌ی خزانده گرفانم‌و به دوو قۆڵی چوینه پیاسه كردن.

ئیستا ئیتر شه‌رم‌و ترسم نه‌ماوه هه‌ر كچێكم تووش بوێت رێك ته‌ماشای ناو چاونی ئه‌كه‌م. كوكوشكێن ده‌ستی دا به‌شانماو پیرۆز بایی لێ كردم.

پاشان **(ئه‌و)** په‌یدا بوو، له‌گه‌ڵ یه‌كه‌مین ته‌ماشادا، یه‌ك دڵ، نه ! سه‌د دڵ عاشقی بووم. چوومه پیرییه‌وه‌و هاوارم لێكرد: «**تكایه نه‌ختێ بووه‌سته** !».

كچه‌كه ته‌ماشایه‌كی كردم‌و وه‌ستا. له هه‌مان كاتا پـه‌نجه‌م نـایه سـه‌ر دووگمه‌كه. كچه‌كه ده‌ستی درێژ كردو به پێكه‌نینێكه‌وه وتی: «**ناوی من لیلیایه، به‌لام هێشتا له ماڵه‌وه ته‌له‌فۆنمان نیه.**» كوكوشكێن خۆی كێشایـه كه‌نـار، رۆیشت تاكو داهێنانێكی تازه وه‌ده‌س بێنێ. كه قۆڵی لیلیام له باسكم نا، هه‌ستم كرد ئه‌و كچه‌ی له بیرو هۆشم دایه ده‌سم كه‌وتووه.

مانگێكی رێك چـاومان بـه یه‌كتـر ئه‌كـه‌وت. له ته‌واوی ئـه‌م ماوه‌یـه‌دا ئامێره‌كه‌ی كوكوشكێن له گرفانم‌دابوو.. لیلیا رازی بوو ببێته هاوسه‌رم. له ماوه‌ی ئه‌و چه‌ن هه‌فته‌یه‌دا كوكوشكێن هه‌ر دیار نه‌ما. به‌لام ئه‌مرۆ واته رۆژێـك پێش سوور كردن بوو كه ته‌له‌فۆنی كردو وتی:

«**پێـویست ناكـات هیچم پێ بلێی، نـه‌ختێ وه‌ره ده‌رێ، ئه‌مـه‌وێ شتێكت پیشان ده‌م**».

نازانم بۆ دڵم داخورپا، گوێم نه‌دایێ و ڕام كرده ده‌ره‌وه.

كوكوشكێن سواری شتێك ببوو له ئوتومبیل ئه‌چوو، دارای پێنج چه‌رخ‌و له پێشیه‌وه‌ش په‌روانه‌یه‌كی هه‌بوو، هه‌ر یه‌كه له‌و چه‌رخانه به لایه‌كا ئه‌سووڕانه‌وه، كوكوشكێن ده‌وره‌یێكی گۆره‌پانه‌كه‌ی داو له نزیك منه‌وه برێكی گرت، دوایی وتی: «**سوار به**» به تووڕه‌ییه‌وه وتم: «كوكوشكێن، مه‌گه‌ر نازانی ؟ من له سبه‌ینێه‌وه ده‌بمه پیاوێكی به‌خته‌وه‌ری خاوه‌ن ژن‌و ماڵ. مه‌سه‌له چیه ؟ من هیچ مه‌به‌ستم نیه سواری ئه‌م دوو چه‌رخه‌یه‌ی تۆ ببم».

كوكوشكێن كه به فیزێكه‌وه تێیڕوانیم وه‌لامی دایه‌وه:

«ئه‌مه دوو چه‌رخه نیه. ئه‌مه ئامێری زه‌مانه‌یه. نیازم وایه بۆ ئاینده بتبه‌م تاكو به چاوی خۆت ببینی كه ژیانی داهاتووت چۆن چۆنی ئه‌بێت».

سه‌فه‌رێك له‌م زه‌مانه‌وه به‌ره‌و ئاینده، بۆ ئه‌وه‌ی دوارۆژو به سه‌رهاتی خۆم ببینم، هه‌ر چۆنێك بێت بیرێكی باش بوو. بێ ئه‌وه‌ی ئیتر هیچ قسه‌یـه‌ك بكه‌م، سوار بووم، كوكوشكـێن ماشینـه‌كه‌ی ئیشی پێكـردو به تـوندی لێی خـوڕی

چەرخەکانیش خێراو بە پەلە دەڕۆیشتن، لەپڕدا دونیا تاریكو نوتك بوو. پاشان دەنگێك هاتە بەر گوێو هەموو لا ڕۆشن بووەوە. کوکوشکین برێکی گرتو بە ئاوازێکی پڕ چۆشەوە ڕایگەیاند کە:

«**زەمانی ئایندەیە**».

لە ماشینەکە هاتمە خوارو نیگاییکی دەورو بەرم کرد. هەموو شت بە باشی ئەهاتە پێش چاو. کوکوشکین پەنجەی بۆ نزیکترین خانوو درێژ کردو وتی: «ئەوە شوێنێکە کە تیایا ئەژیت. خانووی ژمارە ٢٨. بڕۆ داهاتووی خۆت ببینەو منیش لێرەدا چاوەڕێت ئەکەم».

لە کاتێکدا دڵم لەناو سنکمدا فڕی بوو، بەرەو خانووی ژمارەی ٢٨ چوومو لە زەنگی دەرگاکەمدا. دوای ماوەیەك دەنگی لیلیا دای بە گوێما.

ـ ئەمە دوا جارت بێ، جاری تر دەرگات بۆ ناکەمەوە ! هەموو مێردەکان خۆیان دەرگا ئەکەنەوە. هەر تۆی کە هەمیشە کلیلەکان ون دەکەیو بەم زەنگ لێدانە گەوجانەت دووچاری مەینەتیم دەکەی.

دەرگا کرایەوە، لیلیا چاخو قەڵەو بوو، یا باشترە بڵێم ترسناکیش بوو، بەرانبەرم وەستاو ڕێگای لیێ گرتم، زۆر بە دڵنیاییەوە پرسی: «**ئەی گوڵەکانم کوا** ؟».

نا ئومێدانە وەستا بووم: «وا بزانم من ڕۆژی ڕۆبڵێکت ئەدەمێ، بەلاَم تۆ ئەتوانیت بەسێ کۆپك وەك پادشا بژیتو بەو پارەیەش کە ئەمێنێتەوە گوڵم بۆ بکڕیت. پێنج ساڵە بەسەر زەماوەندماندا تێپەڕیوە بەلاَم تۆ هەموو بەڵێنو قەولو قەرارت فەرامۆش کردوە. ئەمەیە قسە خۆشەکانت کە ئەتووت نەك ڕۆژێك بەڵکو ساتێك لە بیرم ناچیت ؟.

ئاخ، ئێوەی پیاوان هەموو وەکوو یەکن، پێش زەماوەند هەموو جۆرە گفتێك ئەدەن هەر کە کەرتان لە پرد پەڕییەوە هیچتان لە یاد نامێنێ. ژنت هێناوە یان کارەکەر ؟ نە، تۆ خۆت بڵێ ؟ ئەگەر وانیە، ئەی بۆ ئەمڕۆ بەیانی قاپو قاچاخەکانت نەشۆردوە ؟ هەموو شت تێپەڕێ، ئێمە بڕیارمان دابوو بە نۆرە بیان شوێن، وا نیە ؟

بڕیار وابوو بیست ساڵی پێشوو تۆ بیان شۆی، دواییش بیرێکی لێ بکەینەوە. تەماشاکە خانووەکەمان چی بەسەر هاتووە ! ناتوانی ڕۆژی نەختێك پاکی بکەیتەوە ؟ تەنها ئەوە ئەزانی دەنگم دەرکەی، بەلاَم ئیتر بەسە. ئەمەوێ بۆ سینەما بڕۆم، بێ هودە تکام لێ مەکە لەگەڵ خۆمدا بتبەم، لە سینەماش هەمیشە

پیشـەت ئەوەیـە بۆڵە بـۆڵ بکەی و خـەوت لێ بکەویّ و لەدەم خـەودا لەگـەڵ کوکوشکینی دۆستت دردە دڵ ئەڕێژیّ. باشتر ئەوەیە زبڵەکان فڕیّ بدەیتە دەرێ.
دواییش سەوزەو نان بکڕیت. لە بیرت نەچیّ چێشت لێنێیت. ئەوەشت لە بیر بیّ کە بە دزییەوە لە مۆبەق جگەرە نەکێشی ! ئەگەر زۆر حەز لە جگەرە کێشان ئەکەی بڕۆ سەر قاڵدرمەکە، ئەویش دوای دەرچوونم. بجوولێـوە چیتە وشـك بویتەتەوەو بە واق وڕمانەوە سەیرم دەکەی ؟ کەوتمە بیر کـردنەوە: «**کـەواتە کارەسات بەم شێوەیەیە: جگەرە کێشان لە سەر قاڵدرمە. وا ئەزانیّ گەوجی دەست کەوتووە ! نەء، من خواردنی ئەو نیم**».
دەرگای ئایندەم خێرا داخستو بە پەلە بەرەو لای کوکوشکین گەڕامەوە.
خەریکی جەرخی ماشینەکەی بوو. هـاوارم کرد: «**کـوکوشکـین، رزگارم کـە، پەلەکە ! بیرێك بکەرەوە، من لیلیای وام ناویّ**».
کوکوشکین زۆر بەهێمنیەوە وتی: «چارەکردنی ئاسانە. ئەگەڕێینەوە ئەو رۆژەی کە بۆ هەوڵ چار لیلیات بینی. تەنیا ئەبیّ ئیشێك بکەی، کاتیّ بە تەنیشتیا تیّدەپەڕی هیچ قەسەیەکی لە گەڵدا نەکەی».
خۆم فڕیّ دایە ناو ماشینەکەو وتم: «**خێراکە**»
کوکوشکین خێرا لیّی خوڕی، چەرخەکان سووڕانەوەو دووبارە هەموو لا تاریك بوو، دوایی هەمان دەنگ بەرز بووەوە لە پڕ دونیا رۆشن بوو، گەیشتینە هەمان شوێنی خۆمان. دیسان کچی زیباو جوان لە تەنیشتمانا ڕەت دەبوون. لەو کاتەدا لیلیا پەیدا بوو، کوکوشکین بازووی گرتمو چرپاندیە گوێمو وتی: «**ئاگات لە خۆت بیّ**» کاتیّ کە بەترس و خەیاڵەوە بیری ئایندەو چارەنووسی خۆمم دەکرد، نزیکی لیلیا بووم، بریاری خۆم دابوو کە لەگەڵیا قسە نەکەم بەلام کە ڕووبەڕووی یەك بووین، خۆمم پیّ ڕانەگیرا وتم: «**تکایە نەختێك سەبر کە** !» لیلیا وەستاو دەستی بەرەو لای من درێژ کرد. کوکوشکین لە ناخی دڵیەوە ئاهێکی کێشاو گوم بوو.
ئێستا زۆر درەنگە. بڕیار وایە سبەینیّ شایی بکەین.

# جان كۆكتۆ

## یاداشتەكان لەدوای مردن

وەرگێڕانی دانا ڕؤوف

جان كۆكتۆ دوای ژیانێكی دەوڵەمەند لە ساڵی ١٩٦٣دا كۆچی دوایی كردوە، ژیانێكی پڕ لە داهێنان لە هەموو بوارەكانی شانۆ، ڕۆمان، وێنەكێشان، وێنەگرتن، شیعر، وسینەمادا.

كۆكتۆ لە ماوەی پەنجا ساڵدا سامانێكی گەورەی ڕۆشنبیری مرۆڤایەتی گرنگی لە بیرو هونەر جێهێشتوەوجێ پەنجەی بەسەر زیاد لە چەند جیلێكەوە دیارە.

كۆكتۆ جگە لەو سامانە گەورە ئەدەبیەی، دەسنوسێكی گەورەی لە یاداشتەكانی خۆی لەپاش بەجێماوە، كە پێش مردن بە چەند مانگێك تەواوی كردووە، بەلام خۆی وەسیەتی كردوە كە ئەو یاداشتانە تا دوای بیست ساڵ بەسەر كۆچیدا بلاونەكرێتەوە.

بەم شێوەیە ساڵی پارو بەڕەزامەندی بنەماڵەو پارێزەرە تایبەتیەكەی بەشی یەكەم لە یاداشتەكان بلاوكراوەتەوە.

جان كۆكتۆ دوانزە ساڵ بە نووسینی ئەم یاداشتانەوە بەسەر بردووە، لە ساڵی ١٩٥١ەوە دەستی پێكردوەو كۆتایی پێنەهاتووە تا سەرەتای ساڵی ١٩٦٣.

ئەم یاداشتانە لە نۆ بەرگی گەورەداو لەژێر ناوی (ڕابردوویەكی لادراو)دا كۆئەبێتەوە. ئەم یاداشتانەش بە بڕوانامەیەكی گرنگ ئەژمێردێت، نەك

لەبەرئەوەی کە چیرۆکی ژیانی کۆکتــۆ وبیروڕای بــەرامبەر تێکڕای ڕووداوە ڕۆشنبیریی‌و ڕامیارییەکان‌و بۆچوونی بۆ شێوازی فۆرمی ئەدەبی خۆی تیادایە، بەڵکو لەبەرئەوەی دەست‌نیشانی قۆناخێك لە مێـژووی ڕۆشنبیریی‌و هـونەری فەڕەنسا ئەکات کە بەشێوازێکی ئەدەبی بەرز نووسراوە.

کۆکتۆ بەرگی یەکەمی ئەم یاداشتانەی بۆ ڕووداوەکـانی ساڵی ۱۹۵۱ و نیوەی ساڵی ۵۲ تەرخان کردوە. گرنگتــرین ڕووداویش کە لە دوو تـوێی ئەم بەرگەدایە: کەوتنی ئەو هێلە فکریەی کە فرانسوا مۆریاك بە ڕۆمان‌و چیرۆك و شانۆگەریەکانی ڕابە رایەتی ئەکرد، بەرامبەر ڕێبازی (وجودی) کەڕۆژ بە ڕۆژ لە گـەشانـەوەدا بوو تـوانیشی بیروڕای بـەسەر ئـەدەب‌و شـانـۆی مـوریـاك‌و هاوەڵەکانی‌دا بسەپێنێت.

کۆکتۆ بە هۆی لاینگیـری ئەو ڕێبـازەی کە شـانۆگـەری (شەیتـان) ی «سارتر»ی خوڵقاند، تووشی گەلێك ڕەخنەی توندو تیژی فرانسوا مۆریاك دیت کە لەیەکێك لە گۆڤارە ئەدەبیەکان‌دا بڵاوی کردۆتەوە.

ئەو کۆمەڵە ڕەخنەیەش دەنگێکی گەورەی لە ناوەندە ڕۆشنبیریەکەی ئەو کاتەی فەرەنسادا دایەوە لەبەر ئەوەی مۆریاك کۆمــەڵێك ووشــەی ناشـرین‌و مریندارکردنی بەرامبەر کۆکتۆ بەکارهێنابوو.

جیاوازی کێشەی فکری نێوان ڕێبازو قوتابخانە فەلسەفیەکانی فەرەنسا دیاردەیەکەلە دیاردەگرنگەکانی گۆڕەپانی ڕۆشنبیری فەڕەنسی، ئەمەش خۆی لە خۆی‌دا دیاردەیەکی زیندو ڕەسەنیەتی.

لایەنی ڕۆشنبیری لە ژیانی کۆکتۆدا پەیوەندی بە لایەنێکی ترەوە هەیە، ئەوەش ژیانە تایبەتیەکەی خۆیەتی، کە بەهیچ جۆرێك لە بیـرو نووسینـەکانی کەمتر نیە، کۆکتۆ مرۆڤێکی ڕەوشت نامۆو جیاوازە، شیعرو شانۆگەری‌و ڕۆمانی نووسیوە، هەروەها بەرهەمی لەبواری سینماو پەیکەرتاشی‌و وێنەگرتن‌دا هەیە !

ئەم چالاکیە جۆربەجۆرانەشی ڕەنگدانەوەی تاقی‌کردنەوەی ژیانێکی پڕ دوودڵی بووەبۆ ئازارە عاطفی‌و گـەشت‌وگوزارە جـۆربەجـۆرەکانی، هـەروەها جۆربەجۆری ئەو نـاوەندە کـۆمەڵایـەتی یان ئـەدەبی - هونـەری کە کـۆکتۆ پەیوەندی پێیانەوە بوو. بێگومان ئەو تاقی‌کردنەوە ڕۆژانەیەی یەکەمی کارێکی زۆری کردبوە سەر دەروونی، بە تایبەتیش چوارچێوەی خێزانەکەی یەکەمی کە تیا ئەژیا کۆکتۆ تەمەنی دە ساڵان بوو کە باوکی لە ساڵی ۱۸۹۹دا خۆی کوشت، ئەم ڕووداوەش کارێکی قوڵی تێکردبوو، ئەمــەش زیاتـر گۆشـەگیری کـردبوو،

هەروەها ڕووبەڕووبوونەوەی کۆمەڵە پرسیارێك بەرامبەر ئەم بوونە ئاڵۆزە.

بەهۆی ئەم کارەساتە ترسناکەوە، خێزانەکەی ئەگوێزنەوە بۆ شارێکی ترتا لە «تارمایی» خۆکوشتنەکەی باوکیان رزگاریان بێت.. دوای ئەوە بە ساڵێك (١٩٠٠) جان‌قۆناخی‌سەرەتایی تەواو ئەکات. لە ئامادەیی (کۆندرسیە) ئەبێتە هاوڕێی کۆمەڵێك قوتابی کە هەندێکیان لە دواییدا ئەبنە هاوڕێی گیانی بە گیانی.

لە ساڵی ١٩٠٧دا باپیری ئەمرێت و خۆی و دایکی بە تەنها ئەمێننەوە دوای ئەوەی کە خوشکەکەی شوو ئەکات و براکەشی بەرەو کاری (المصرفي) ئەچێت.

لەهەمان ساڵدا، کۆکتۆ ئەکەوێتە داوی خۆشەویستی (مادین‌کارلییە)ی کیژە ئەکتەری شانۆو بە هەموو پاکی هەرزەکاریەوە یەکەم تاقیکردنەوەی خۆشەویستی لەگەڵ مادلین ئەکات، بەهۆی ئەم تاقیکردنەوە دڵداریەوە واز لە قوتابخانە ئەهێنێت، دوای ئەوەی کە دووجار لە تاقی‌کردنەوەی (بەکەلوریەدا) دەرناچێت.

دوای ئەوە دەست ئەداتە نووسینی شیعرو بەرەو جیهانی ئەدەب ئەچێت و ئەکەوێتە ناسینی ناوەندە ئەدەبیەکە، بۆ یەکمجاریش شیعرەکانی لە ئاهەنگی ئەدیبە لاوەکان دا ئەهوێنێتەوە.

لەساڵی ١٩٠٨دا تێکستە شیعریەکانی لە گۆڤاری (هەموو شتێك ئە زانم) بڵاوئەکاتەوە کە گرنگی داوە بە بەرهەمی لاوان و لەم ساڵەش‌دا ئەبێتە هاوڕێی (مارسیل بروست)، وپرۆژەی گەشتەکانیشی بۆ دەرەوەی فەرەنسا دەست پێ ئەکات، یەکەم هەواریشی فینیسیای ئیتاڵی ئەبێت.

١٩٠٩ یەکەم کۆمەڵە شیعری (گلۆپی ئەندا) بڵاوئەکاتەوەو خانوەکەی جێ‌ئەهێڵێت وژوورێك لە گەرەکی (هوتیل بیرون) لە پاریس بەکرێ ئەگرێت، لەم ژوورەدا بەتەنها ئەژی و هەموو کاتی بۆ خوێندەوەو نووسین تەرخان ئەکات.

هەر لەم ساڵەداو بە ریامەتی روستان و بیرنوار گۆڤاری (شهرزاد) دەرئەکات.

لە ساڵی ١٩١٠دا کۆمەڵە شیعری دووەمی (میرە هەڵەشەکە) بڵاوئەکاتەوەو ئەگەڕێتەوە بۆ ماڵەکەی و لەگەڵ دایکی ئەژی و ئەکەوێتە وێنەکێشان، وێنەی پۆستەری دیواری بۆ جەند شانۆگەریەك و هەندێ لە پێش‌کەش کردنی (بالیە) و پڕوپاگەندەی پێش‌کەش کردنە جۆر بەجۆرە هونەریەکان ئەکێشێت.

له سـاڵی ١٩١٢ کۆمـەڵە شیعـری سێیـەمی (سـەمـای سـوفـۆکلیس) بڵاوئەکاتەوەو لە بەهاری ئەو ساڵەدا ئەچێت بۆ جزائرو ئەکەوێتە نامە گۆڕینەوە لەگەڵ نووسەری بەناوبانگ (ئەندریە جید).

ساڵی ١٩١٣ کۆمەڵە شیعری چوارەمی بە ناوی (دوو زیندوو ئافرە تێکی مردوو) بڵاوئەکاتەوە، و لە پایزدا ئەچێت بۆ سویسرا بۆ بەشداری کردن لە بالیەی (دافید) لەگەڵ ستـرافنسکی.. دوای ئەوە سەرپەرشتی بـڵاوکردنـەوەی کارە ئەدەبیەکانی ئەکات هەروەها لەگەڵ بول ئیریب گۆڤارێك دائەمەزرێنێت بە ناوی «ووشە» ەوە..

لەم ماوەیەدا خۆی بە شاعیر ئەبولونیرو بیکاسۆی هونەرمەنـدو ئەدیب ماکس جاکوب و شاعری سریالی ئەندریە بریتون ئەناسێنێت.

لە ساڵی ١٩١٧دا بەرەو رۆما ئەچێت و لەوێ پەیوەندی لەگەڵ گەشاوەترین ئەدیبە ئیتالیەکان ئەکات و پاش چەند هەفتەیەك ئەگەڕێتەوە بۆ پاریس و بەردەوام ئەبێت لە چالاکیە ئەدەبی و هونەریەکانی بەتەواوی سەرقاڵی ژیانی رۆشنبیری ئەبێت.

لە ساڵی ١٩٢٢دا شانۆگەری (ئەنتیگۆنا) کە لە نووسینی خۆیەتی بۆ شانۆ دەرئەهێنێت، ئەمەش یەکەم بەرهەمیەتی کە خۆی بەشداری بەرهەم هێنـانی بکات لەگەڵ کۆمەڵێ سریالیەکان کـە تازە خـەریك بـوو وەك جووڵانـەوەیەکی کارتێکەر لە گۆڕەپانی رۆشنبیریدا سەری هەڵئەدا.

لە ساڵی ١٩٢٤دا شانۆگەری (رۆمیو و جولیت) پێشکەش ئەکات دوای ئەوەی کە بە شێوەیەکی تازەو لە تێڕوانینێکی سریالیانەوە ئامادەو چارەسەری ئەو بابەتە تقلیدیە ئەکات.

لە ساڵی ١٩٢٥دا یەکەم پێشانگای تایبـەتی لە بروکسل ئـەکاتـەوە، لەم ساڵەشدا شانۆگەری «ئۆدیب» لەگەڵ ستـرافنسکی پێشکەش ئـەکات، ئیتـر بەردەوام ئەبێت لە بڵاوکردنەوەی داهێنانە ئەدەبیەکانی و کردنەوەی پێشانگای جۆربەجۆری وێنە یان تابلۆ کە وێنەو شیعر پێکەوە کۆئەکاتەوە کە ناوی نـابوو تابلۆی شیعر.

لە کۆتایی بیستەکاندا ڕوو ئەکاتە سینما بوارێکی تعبیرکـردن و یەکـەم فلیمی (خوێنی شاعر) ئەبێت کە دەریهێناوە (ئەم فلیمە بـۆ یەکمجـار لە سـاڵی ١٩٣٢دا پێشکەش کراوە)..

جنرال ئأيرونسايدو مجۆر نوئيل لەم مەسەلەيە بكۆڵنەوە پێش ئەوەی سەرۆك (وەزیری ناوبراو) گۆنگرەكە بە جێ بهێڵێت.

تێبینیەكانی وەزیری ناوبراو بۆ لێكدانەوەی تێكرایی دوو لێژنەی سیاسیو سوپایی ئەم باش نیوەڕۆیە (١٥ مارت ١٩٢١). لە جێگاییێكی تردا لە هەمان وەسیقەو سەرچاوەدا ئەم ناو نیشانە هەیە:

## ٣ - كوردستان

لێژنە لە سەریەتی كە بابەتی پێویست دەربارەی كوردستان ئامادە بكات لە پێناوی وە پێش خستنی گوزەرانو سودی هاو وولاتیانی كورد. ئەگەر چی بریاری دووایی لەولایەن كۆمیتەی سیاسی دەر نەبرا، لێژنەكە ئەم پێلانەی خوارەوەی پەسەند كرد:

كوردستانی بە ئینتداب بەستراو ئەبێت لە لایەن مەندووبی سامییەوە یەك سەر بەڕێوە بچێت واش باشترە بەیارمەتی ئەبخومەنێكی ناو خۆیی لە سەرۆكانی كورد ئەم ئیدارەیە بەڕێوە بچێت.

بۆ ئەم بەڕێوە بردنە یارمەتی داراییپان پێ بدرێت لە گەڵ یارمەتی تر، هەمیشە بە ئاواتی ئەوەوە كە تخوبەكان بپارێزرێن لە بێگانە بە ئاواتی ئەوەوە لە گەل كردنەوەی دەرگای بازرگانیەتیو پێك هێنانی هێزێك لە سودی ئیمپراتوریەتدا. لە هەمان كاتدا هێزێكی لیڤی كورد لە چەند تیپێك دابمەزرێت لە ژێر فەرماندەی ئەفسەری ئینگلیزو ئەفسەری تردا. وە تا وەكو (١) ئەكتوبەر ئامادە بكرێن.

هەر وەها بە پێی توانا هێزێكی لیڤی سواریش لە تەك ئەم هێزە كوردەدا پێك بهێزێت.

سەر ئەنجام بەگشتی... هێزێكی كورد دە بێ پێك بێت تا وەكو هێزی هێمنایەتی ئێمە (واتە هێزی بەریتانیا) بتوانێت لە ماوەی شەش مانگێكدا ناوچەكانی كورد بەجێ بهێڵێت و بكشێتەوە.. پێویستە مستەر كرۆسلاند ئەو

بە داوی تەواو بوونی ئەم فلیمە بەردەوام ئەبێت لەسەر هونەری سینمائی، ئەمە جگە لە چالاکیە ئەدەبی و هونەریەکانی تری.

ساڵی ١٩٤٥ چاکترین فلیمی دەرئەهێنێت: (درندەو ئافرەتە جوانەکە).

کۆکتۆ، ئەو وزە گورجوگۆڵە بێ سنورە بەخشندەیە.. لە هەموو دەرگاکانی ئەدەب و هونەرو شێوازە تعبیریەکانی داوە، بازنە پەیوەندی نێوان هەموو کۆمەڵە ڕۆشنبیری و هونەریەکانی بووە تا لە ساڵی ١٩٦٣دا کۆچی دوایی کردوە.

ئەو چالاکی و جووڵانەوە گورجوگۆڵەی کۆکتۆ، جێی سەرنج و تێڕامانی هەمووان بووە. یەکێك لە هاوڕێکانی ئەڵێت:

کۆکتۆ گونجابوو لەگەڵ ئەو هێڵە هونەریەی کە بۆ ژیانی هەڵبژاردبوو، ئەو هێڵەش زۆر لە کۆکتۆوە نزیك بووە: چ لە ڕووی بیرو چ لە ڕووی گیان و لەشیەوە. کاتێك کە تابلۆکانی ئەبینین یان نووسینەکانی ئەخوێندینەوە، ئەو هێڵە بەشدارە ئەبینین کە ڕەنگ دانەوەی وێنەکانیەتی، هێڵێکی باریکی هەمیشەڕارایە، باوەش بۆ ڕاستی ئەگرێتەوە یان بە شێوازێکی تایبەتی کە پێی ئەووترێت (هۆشمەندیەکی گرژ) بە ڕەنگاری ئەبێتەوە، بۆ خۆی و لە هەمان کاتیستا دژی خۆی وەك کۆکتۆ کە خۆی ناوی ناوە.

وەنەبێ جان کۆکتۆ هەوڵی ئەوەی دابێ کە ببێتە هونەرمەندێکی نوێ یان هاوچەرخ، بەڵکو بە شێوەیەکی (لاإرادی) بە سەردەمەکەیەوە بەسترابوو. لەبەر ئەوە کاروانی هونەری و ڕۆشنبیری بەرەو دادائی وسریالیەکان جۆرە سەپاندنێك بووە بەسەریا. بۆیە ئەیویست شتەکان بەرگێکی تر لەبەربکەن، تا ئەو ناوەڕۆکە نوێیەی کەچاخیبیستەم سپاندبووی دەربکەوێت.

١٩٨٤/٣/٢٤

**سلیمانی**

---

**لەرۆژنامەی «الجمهورية» ەوە وەرگیراوە**

**مكتب الجمهورية ـ باريس ـ العدد ٥٣١٦**

●

# «رەخنە دەبێ چۆن بێ؟»

محمد عبدالرحمن زەنگنە

رەخنە شتێکی جوان و چاکە،
ئەگەر مەبەستەکەی ئەوەبێ لایەنە
خراپەکان و چاکەکانی نووسەر بخاتە روو،
نەک رەخنە ببێتە هۆی تانەو تاشەرو
گلەیی وشتە کۆنەکانی بجوێتەوە
رەخنەگر نابێ چەکوشێکی بە دەستەوە
بێ وبداتە سەر نووسەرا. رەخنە دەبێ
ببێتە هۆی پێشخستنی نووسەر نەک
رووخاندنی.

نووسەری رەسەن دەبێ لە رەخنە نەترسێ و بە سنگ فراوانییەوە پێشوازیی بکات و ببێتە هۆیپێشکەوتنیو سودی لێ وەرگرێ، ئەگەر ئەو رەخنە گرە، رەخنەگرێکی لێهاتوو بە توانا بێت.

بەڵام ئەوەی ئەمرۆ من تێبینیم کردووە، ئەوەیە، زۆربەی رەخنەگرەکانمان، نەک رەخنە نازانن چی یە بەڵکو نووسینیان نی یە، کەچی

له شەو رۆژێکدا دەبێ بە رەخنەگر. بوونە بە رەخنەگر کارێکی ئاسان نیيە رەخنەگر دەبێ لە نووسەر شارەزا ترو لێهاتو تر بێت.

ئەگەر رەخنەگرێك لە نووسەرەکە بە توانا ترو زیرەك ترو لێهاتو تر بێ، ئەوا ئێمە هیچ نالێن، بەلام ئەگەر رەخنەگر شارەزا نەبوو، لە نووسەرەکەش باشتر نەبو، ئەوا ئەوانەی شتیان بۆ بلاو دەکەنەوە بێگومان لە نووسەرو رەخنەگریش کەمتواناترن.

بەڵێ ئەمڕۆ هەندێك، واتە هەندێك لە نووسەر شت بلاو دەکەنەوە شایانی ئەوەیان نیيە لە ناو خەڵکیشدا دانیشن، جا نازانم چۆن رێدەدرێن رەخنەیان بۆ بلاوبکرێتەوە.

پێویستە ئەم دیاردەیە بە جوانیو بە باشی لە لایەن بەرێوەبەری لاپەرەکانی رۆژنامەکانو گۆڤارەکانەوە چاو دێری بکرێن.

ئەوەی من بیستوومە و خوێندومەتەوە پێویستە رەخنەگری تایبەتی هەبێ بۆ هەر بلاو کردنەوەیەك، من زۆر بە دڵ نیاییەوە دەڵێم، کە ئێمە رەخنەگری تایبەتیمان نیيە، من بۆیە ئەم قسەیە دەکەم چونکە ئەوەی رەخنە دەگرێ خۆی لە هەموو شتێك هەڵدەقورتێنێو لە هەموو شتێکە شارەزایە. لە شانۆ دا هەر خۆی رەخنەگرە، لە چیرۆکدا لە شیعر دا لە پەخشاندا لە مێژوو دا هەر خۆی شۆرە سواری گۆرەپانە لە کۆتاییدا دەڵێم رەخنە لە شتی چاك دەگیردرێ تا دەستی یارمەتی بۆ نووسەر درێژ بکرێ، بۆ ئەوەی بەرهەمی باشترو بە پێز پێشکەش بە گەلو نیشتمانەکەی بکات.

کەرکووك

# چیرۆکی منداڵان و گرنگیتی ی له ڕۆشن کردنەوەی بیرو هۆشی منداڵان دا

هاشم جەباری

له گۆڤاری
(الفيصل) ژماره (٩٢)
وەری گێڕاوه

که منداڵ بوین، دایك یا داپیره دەیەها چیرۆکی جوان‌و دڵڕفێنیان بۆ دەگێڕانیەوە، زۆر جاریش ینەوه چیرۆکەکان کاریان تێ دەکردین چونکه چیرۆکی مرۆڤایەتی بون‌و فێری ئارام‌و دانایی‌و خوو ڕەوشتی جوانیان دەکردین.

ئێستا ئەم پرسیاره سەر هەلدەدات: ئایا سەردەمی گێڕانەوەی چیروك بۆ منداڵان به سەرچوو ؟.

به داخەوه لەوانەیه له وەڵامی ئەم پرسیاره دا بوترێ بەڵێ. بەڵام هۆی چیه ؟.
له ڕاستی دا دایکان ئێستا ئەم دەرفەتەیان نیه چونکه باری ژیان وای سەپاندوه دایکان زۆربەی کاتیان له دەرەوەی ماڵەوه دا بەسەربەرن، لەکارگەوفەرمانگه وجۆرەها ئیش وکاردا.

هەروها داپیران وەکو جاران تونـاو ئارامیـان نیە دابنیشن‌و چیـرۆك بۆ منـدالان بگێڕنەوە، جگە لەمەش زۆربەی منداڵان دەچنە با خچەی منداڵان، ئەمەش تا ڕادەیەك بۆبۆتە هۆی پچڕانی پەیوەندی‌ی نێوان داپیرەو منداڵ، هەروها تەلەفزیۆن‌و شانۆو سینەما ڕۆڵێکی باڵایان لە بڕینی پەیوەندی‌ی نێوان داپیرەو منداڵ دا هەیەو باڵیان بە سەر دەست بەتاڵی‌ی منداڵان دا کێشاوە.

بچڕانی ئەم جۆرە هونەرە لە نێوان دایك‌و منداڵ‌و داپیرە دا کارێکی گەورەی کردۆتە سەر ئەو پەیوەندی‌یەی ئاماژەمان کرد.

منداڵ کە تەلەفزیۆن‌و سینەماو شانۆ دەبینێ تەنیا وەکو بینەرێك بۆیان دادەنیشێ، ناتوانێ هەستی خۆی دەرببـڕێ، بەڵام بـە پێچەوانـەوە ئەگـەر لە باوەشی دایـك‌و داپیرەی دا دانشتبێ دەیەها پرسیار دەخاتە ڕو. بۆ دوپات کردنەوەی ئەم ڕایەمان با چیرۆکێك بۆ منداڵەکەمان بگێڕینەوە دەبینین تا چ ڕادەیەك کاری تێ دەکات‌و لە چوار چێوەی ئەو پرسیارانە دا کە لە بارەی چیرۆکەکەوە دەیانخاتە ڕو بۆمان دەردەکەوێ چەنێ تێ‌ی گەیشتوە.

## (ئەو چیرۆکەی کە منداڵ پێ‌ی خۆشە)

لێرە دا ناتوانین یەکسەر وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە؛ چونکە منداڵان وەکو یەك نین، هەندێکیان بایەخ بە ڕاستی دەدەن‌و حەزیان لە چیرۆکی ئەفسانەو جنوکەو تەڵەکەبازی نیە، بەڵکو ئەو چیرۆکەیان پێ باشترە لە ڕاستی‌یەوە نزیك بێ، لێرە دا نابێ وا سەیری ئەو منداڵانە بکەین کە گوایە ئەندێشەو خەیاڵێکی فراوانیان نیە، بەڵکو بە پێچەوانەوە واقیع‌و سروشت بە نیسبەتی ئەمانەوە کتێبێکی داخراوی پڕ نهێنی‌یە.

هەر وها هەندێ منداڵ حەزیان لەو چیرۆکانەیە کە پاڵەوانەکـانیان خـەیاڵین‌و لە ژیان‌و تاقمانەی تایبەتی‌یانەوە دوورن... دەبێ لەم لایەنەوە زۆر ئاگادار بین چونکە ئەم جۆرە منداڵانە بە دلخۆشی‌یەوە گوێ بۆ ئەم جۆرە چیرۆکە شل دەکەن ، تەنانەت هەندێکیان وا هەست دەکەن کە خۆیان پاڵەوانی چیرۆکەکەن ، هەوڵ دەدەن بە هەمان کردەوەی پاڵەوانەکە هەڵبستن ، لە لایەکی‌ترەوە وا هەست دەکەن تووشی جـۆرەها مەترسی دەبن ، ئەمەش وایان لێ دەکات هەمیشە لە باری دوودڵی‌و نارەحەتی دا بژسن ئاشکرایە کە منداڵ بە ڕۆژ هەست بەترس ناکات چونکـە خەڵکی تـری لە گەلدایـەو بەیاری‌ی‌کردن‌خەریك‌دەبێ... لە گەڵ داهاتنی تاریکی دا ترسی لێ دەنیشێ ، بە تایبەتی ئەگەر بە تەنیا لە ژوورێکدا بخەوێ. بۆیە ئەگەر هەستمان کرد منداڵ لە گێڕانەوەی چیرۆکێك دا هەست‌بەجۆرەنارەحەتی‌یەك‌دەکات‌دەبێ‌دەست‌بەجێ‌لە چیـرۆکێکی تر

بکەڕێین کە زیاتر هێمنیو دڵنیایی پێ ببەخشێ . چونکە منداڵ هەر وەکـو وتمان زو کاری تێ دەکرێو پێویستیی بە چیرۆکێك هەیە ترسو تۆقاندنی تێدا نەبێ ، دەبێ لە چوار چێوەی چیرۆکەکە دا ئەوەی تێ بکەیەنین کە ئادەمیزادی خرابو شەڕ خـواز چارەنوسێکی ڕەش چاوەنواریەتیو لە ئەنجام دا هەر چاکە سەر دەکەوێ.

زۆر دایكو باوك خەیاڵێکی فراوانیان بۆ نوسسینو گێڕانەوەی چیروك بۆ منداڵان هەیە ، بەلام پێوستە بڵێین دەبێ لەم جۆرەچیرۆکانەدا بزانرێ منداڵ بایەخ بە چ دەدات، ئـەگەر منـداڵەکە چـرۆکەکـەی بە دڵ بـو دەبێ چیرۆکێکی تـری بـۆ بگێـڕرێتـەوە پاڵەوانەکەی هەمان پاڵەوانی چیرۆکی پێشووبێ ، دەبێ وا بکات منداڵەکـە لە گەڵ پاڵەوانەکە دا لە ڕوداوێکی نوێ دا بژی ، بەلام نابێ دایكو باوك بەم کارە هەڵبستن ئەگەر توانای ڕاستەقینەیان لە نوسینو پێك هێنانی چیروك دا نەبێ ، چونکە منداڵی ئەمڕۆ ژیرو چاو کراوەو زیرەکە ، دەیەها پرسیار ئاڕاستە دەکات کە لەوانەیە نەتوانن وەلامی بدەنەوە ، ئەو کاتەش لە بەر چاوی منداڵەکە سووك دەبنو بڕوایان پێ ناکات ، بۆیە داوا لە دایكو باوکان دەکەین جۆرە چیرۆکێك بۆ منداڵەکەیان بگێڕنەوە کە لە گەڵ بیرو بۆ چونی دا بگونجێ.

گێـڕانەوەی چیـروك شتێکی ئاسـان نیە ، بـۆیە دەبێ پێشی گێـڕانەوەی زۆر بـاش بیخوێنینەوە تاکو توشی هەڵە نـەبینو هـەندێ ڕووداویمـان لە بیر نـەچێتەوە کـە لەوانەیە لە نرخی چیرۆکەکە دابگرن . وابزانم ئەوڕۆژە هاتووە بیر لە منداڵەکانمان بکەینەوە ئەگەر بمانەوێ دوا ڕۆژێکی ڕووناکیان بۆ دەستە بەر بکەین.

●

# کارەساتی دۆڵی نیشاوێ(١)

ئەسعەد عەدۆ

# لە نێوان فۆلکلۆرو مێژوودا..

هەرچەندە مەسەلەی سەردەمو زنجیرەی مێژوویی لە فۆلکلۆردا بایەخی پێ نادرێ، بەلکو بە ڕووداوەکانی سەردەمی گەلێك پێشتر پشت دەبەستێ، هەروەها ئەو کەسانەی بە مەبەستی تۆمارکردن‌و ساغ‌کردنەوەی بابەتی فۆلکلۆرن‌لە زۆر جێگا تووشی بەرانگار بوونی فۆلکلۆرو مێژوو دەبن.. جارێك یەکەمیان خۆی لە گێژاوی دووەمیان حەشار دەداو جارێکیان دووەمیان بە زرنگی کابانەکەی لە کاتی دان‌وئاوێر خۆی دەرباز دەکات‌و بە ڕێچکەی تایبەتی خۆی وەگەڵ ڕەوێ دەکەوێ.. بەلام هەندێك جار ئەگەر لەبەر تام‌و چێژی بەلەزەتی بێ، یان لەبەر کارەساتی دڵتەزێن بێ، هیچ لێك جیا نابنەوە بەلکو زیاتر پاڵ بە یەکتر دەدەن.

لاوکی ئەم جارەمان، یان باشتر وایە بلێین سەربردەی کارەساتی مێژووی سیاسی‌و کۆمەلایەتی نەتەوەکەمان لەو بابەتەن کە هەرگیزاو هەرگیز لێك جیا نابێتەوە.. کە ئەویش دەگەڕێتەوە سەرەتای ساڵەکانی ئەم سەدەیە.

کارەساتی لعلی‌خان،[٢]، هەرچەندە دەبوایە بە کارەساتی سمایل بەگ[٣] بناسرێ، کەچی هەر لەو ڕۆژەی کە ئەو ڕوودا وە قەوماوە بۆتە هۆی کوژاندنەوەی دوا مۆمی لکێکی بنەماڵەی میرانی سۆران و[٤] جەرگی ئەو ئافرەتە کوڕ کوژراوەیان کون کون کردوە، ئەو وشە کاریگەرانەو فرمێسك ڕشتنی لعلی‌خان و نەمانی شۆڕە سوارێکی مەیدانی کورد پەروەری و[٥] بێ دەنگ کردنی داوا کەرێکی سەربەخۆیی[٦] کوردستان، بۆتە هۆی ئەوە کە ئەو کارەساتە بە ناوی ئەو دایکە جەرگ سوتاوە باوبێ !

**«دەڵێ وایێ سەد جاران لە من نایێ،**
**صباح دگۆ ناچمە قەراتی هەولێرا ڕەنگین گەلە برندە لە مانگی پاییزێ بە ڕۆژی چار شەمێ بابەبەر هەوایێ،**
**نوری ئاغە بە سێ دەنگان گاز دەکا.. خۆزیا صباح ئەتو لە من نەبوایە لە هەتیم و تاران بە پاش بکەتیایێ،**
**لە جیاتی دوو گوللە شەش گوللەت لە سمایل بەگی لعلی‌خانی بدابوایێ،**
**خینی سمایل بەگی خۆش دەبو بکەتابوایە جادێ هەولێرێ،**
**بڕشابوایە پێش دەرگا ئەوێ سەرایێ،**
**مەحکەمەی کوبرا تەختی شەوکەت[٧] پاشای بەغدایێ هەردووکیان غەمی و عایدی بابێ تە بوایێ،**
**صباح دەیگۆ نوری ئاغە بە سەرێ تووکەمە بە قەدرێ ناوی خودایێ،**
**بە دەستی ڕاستەم دەفتەرو قەرەمی مەکتەبێ، هەرگرتبو بە دەستی چۆپە لێم دابوو نەیگرتبو جێی کارێ و باش نەخێوایێ،**
**دەنایی سەد جاران نایێ دەنگی ڕەشیدان و ماقول و خانەدانان بڕا لە دنیایێ،**
**هەوری تارانێ ڕانك و چۆغەری زاخۆ دەمانچەی (مانێ) لە سمایل بەگی لعلی‌خانێ میرات بەجێ‌مایێ،**
**لعلی خانێ دگۆ لە خۆم بێ کەسێ سەرشینێ کەس نەمایێ،**
**کەس نیە جوابەکێی بداتەوە گەورەی بەغدایێ»[٨]**

شایەرەکانیش بوونەتە هۆی بڵاوکردنەوەی لە شوێنی جیا جیا، هەروەها بۆتە کەرەسەی فۆلکلۆریست و[٩] مێژوونوسان، سەرەڕای ئەوەی کە ئەم سەربردەیە لە ڕووی قارەمانێتی و دڵداری و وەفاداری بەدوورە ! سەربردەیەکی

ئەوتۆ کە جێگای شانازی نەتەوەکەمان بێ، بەڵام بەراستی سەرنج ڕاکێشەرە ! نەوەك دوو بنەماڵەی کورد ـ واتە بنەماڵەی سمایل بەگ کە لە میرانی سۆرانن و بنەماڵەی باویل ئاغە کە لە خێلی سوورچین ـ لەسەر یەك خاك هاوژیانن.. داب و نەریتی کۆنی کۆمەلایەتی بە هاندانی کۆنەپەرستان و خوێن مژانی نەتەوەکەمان بۆتە هۆی ئەو ناکۆکی و دوو بەرەکی یە کە هەردەم کەسەری شوومی مێژووی نەتەوەکەمانە، ئەگەر ئەو کارەساتە دەستی داگیرکەرانی تیا نەبێ و هەر ئەوانیش ئاگری دووبەرەکیان نەکردبێتەوە بۆ جێبەجێ کردنی پیلانەکانیان، نەوەك ناخۆشی یەکی نێوان دوو بنەماڵەی دراوسێ و هاودەنگی نەتەوەکەیان لە سەر پارچە زەویەکی خودایی، یان ڕێز نەگرتنی گەورەو بچوکایەتی دەگاتە ئەو ڕووداوە دڵ تەزێنەو ماڵ وێرانیەی کە لە (سپیلك) ڕوویدا ؟ نەخێر هەزار جار نەخێر، بەڵکو ئەو ڕووداوە فێڵێك بوو لە سەدان بەڵکو لە هەزاران فێلی ناحەزەکانی نەتەوەکەمان بۆ ئەوەی بتوانن یەکێتی ی گەلەکەمان بپچڕێنن و لە بەرەنگاری دوژمنی خاك و میللەت لاواز بن، تاکو توانای زاڵ بوونیان لەسەر وولات ئاسان تر بێ.

بەڕای من و زۆربەی خەڵکی ئەم وولاتە تۆلەکردنەوە کارێکی پیرۆزە، بەڵام چ تۆلەکردنەوە ؟ تۆلەکردنەوەی[10] نەتەوە لە دوژمنانی خوێن مژو داگیرکەرانی، نەوەك لە پیاوێکی کورد، لە بنەماڵەیەکی تری کورد، کە هۆی سەرەکی ڕووداوەکە دەستێکی بێگانە بووە. لە جیاتی ئەوەی بە دڵێکی پاك چارە سەرێکی بۆ بدۆزرێتەوە، نەوەك ئەو دڵ ڕەشی یە پشت بە پشت بگاتە ڕۆڵەکانی هەر وەکو دەڵێ:

**«هەنگینێ خۆش دەبو شەڕێ من و سمایل بەگی بکەتبوایە بەر جادەیە،**
**مەعلوومە سێ پشتا دوژمنێ مەیە،**
**لەسەر صباحی چاو بەرەکە بیکوژن حەفت ساری حوکم دابوو بە ئەمرێ حاکمێ دەخێلی یە،**
**نوری سوند خۆرە بە ناوێ خودێ بە غەوسی بەغدایێ،**
**ئەگەر بەتار نەکەن ئەوێ شەڕێ ئەوێ دەعوایێ،**
**دەبی بسوتێنم ڕەواندوزی پاشای هۆدەی حەرەمێ دەکەمە تەویلەی دەواران**
**قەسرێ سپی لعلیخانێ داکی دەکەمە کادینی کایێ»**

**یان دەڵێ:**

**«وەکی نوری ئاغە هاتیە سوندەکی خوردایە بە هەرشەش تەراقیٚ ژنی‌یە،**
**ئەگە صباحیٚ بەرنەدەی لە بەندی‌یە**
**شەرت بی سمایل بەگ نەهێلم تێبپەری لە گەری عەلی بەگی‌یە،**
**ئەتوو بکوژین بە حوکمی بەڕابێلو عەینەلی‌یە،**
**بەران چبکەمیٚ بە چولیٚ بمینێتەوە دیوەخانیٚ ئاغەی رەواندوزی‌یە»[11]**

تاکو ئەو جۆرە کارەساتانە سەر لە نویێ لە نێوان جوامێر ترین قوتابی ئەو سەردەم کە ناوی صباح و سمایل بەگی تاکە مۆمی بنەماڵەی میرانی سۆران، ئەو داب و نەریتەی کۆمەلایەتی بۆگەنی نەتەوەکەمان جێگای داخە، جا پێویستی سەرشانی ڕۆڵەی ئێستامان ئەوەیە، بە هەوڵ و تەقەلایەکی زانیستانە چارەسەری ئەو جۆرە ڕووداوانە بکەن و سوود لە چەوتی ڕابووردومان وەربگرن و ڕێگای ئاگر خۆشکەران بگرن و شوێنی زامەکانمان دەست نیشان بکەن.

## سمایل بەگ کێیە ؟

هاملتۆن دەڵێ:

«ئەو ڕێگایەی کە بە هوێنی ئەو سوور بوو، بە کۆمەك کردنی ئەو تەواو بوو، کە هەردەم بە ئومێدی ئەوە بوو، پێشکەوتنی میللەتەکەی لەو ڕێگایەوە دێت ! با ببێتە پەیکەری یادگاری حاکمی بە سوود ترە لەو قەلایە کاوڵ بوانەی کە کۆر پاشای باپیرەی دروستی کردبوون».

سمایل بەگ کوڕی سەعید بەگی عەبدوڵلا پاشای بەکر بەگی باپشتیانە، لە دەوروبەری ساڵی ١٩٠٠ بەرامبەر بە چیای (کۆرەك)ی، سەرفاز چاوی هەڵێناوەو لە باوەشی لعلی‌خانی دایکی و شارە خەرپووتەکەی رواندوز.. هەوای کوردستانی هەلژیووەو بە ئاوی ساردو شیرینی (بێخاڵ) تینوەتی شکاوە.

لەو کاتەی تەمەنی گەیشتۆتە حەوت هەشت ساڵان، ناوچەکەیان مەیدانی زۆران بازی داگیرکەران بووە، لەبەر ئەو هۆیەوە هیچ لایەك بیری لە هوشیار کردنەوەی خەڵکی سەوادی ئەو ناوچەیە نەکردۆتەوە بۆیە ئەویش وەکو هەزاران لاوی کوردی ئەو سەردەم بە کوڵەواری ماوەتەوە،[12] لە لایەکی ترەوە پەروەردە کردنی ئەو تاکە کوڕە لە ناو کۆشك و تەلانی عەبدوڵلا پاشای باپیرەی، تاکو نەبێتە

داراییەی کە لەم ئاڵو گۆڕەدا وە دەست دەکەوێ پیشان بدات و بیژمێرێت بۆ ساڵی ١٩٢١ ـ ١٩٢٢. لە هەمان کاتدا کەم کردنەوەی خەرجی تریش لە پاش رۆژی (١) ئەکتوبەر ی ١٩٢١ یانە (١) کانونی دووەمی ١٩٢٢ وەوە. پێویستە کۆمەکی تەواو هەبێت لە نێو هێزی ئاسمانی و هێزی لیڤی دا.

بۆ زیاتر قوڵ بوونەوە لە بریارەکانی ئەم کۆنگریە هەمیشە بڕوانە وەسیقەی ژمارە (س.أو.) (٧٣٠) (١٣) (٠٥٢٢٥) (٩،٤).

●

وەکو ڕۆژ ئەو مەهە لەو دوورە دەرکەوت
لە مێوە ئەشکو ئاهی ئێمە سەرکەوت

کە ئەو لێوو ددانەم دی بە جاریٚ
لە بەرچاوم هەموو لەعل و گوهەر کەوت

وەنەوزێکم شەوێ دا، گەیە سەرمو،
وتی: هەستە، هەتاوت وا لەسەر کەوت

لە کێ یارەب خەبەر پرسی بکەم من
کە هەرکەس بۆ خەبەر چوو، بێ خەبەر کەوت

«مەجویی»

قۆچی قوربانی دوژمنایەتی باوکی، بەڵام دەولەمەندیو جێگاو شوێنی باوکی لە نێو خەڵکی ناوچەکەو دەوروپشتی بۆتــە هۆی شــارەزایی لە زامانی تــورکی، عارەبی فارسی، فەرەنسی.

کاتێ سمایل بەگ پێ لە قۆناخی مێرد مندالی ناوە، گەورەترین کارەساتی بە چاو بینیوە، ئەویش کوشتنی[١٣] ســەعید بــەگی باوکی بــووە، هەر لەو رۆژەوە لعلیخانی دایکی کورد گوتەنی «ماران گەز لە گوریسی رەش دەترسێ» سمایـل بەگی لە نێو قەفەس بەند کردوە بە مەبەستی لە ناو نەچوونی ! کەچی خەڵکی ناوچەکە بە چاوی سەعید بەگیان تەماشا دەکردو رێزیان لێدەنا، بۆیە هەر یەکەم رۆژی گەیشتنی داگیرکەرانی ئینگلیز بۆ رواندوز خەڵکەکە بە ئومێدی ئاوەدان کردنەوەی ناوچەکەیان شان بە شانی سمایل بەگ راوەستاون.. هەر لە رۆژی ١٥/١٢/١٩١٩ لە ســەر بڕیــاری سەرەك هــۆزەکــانی نــاوچــەی روانــدوزو دەوروبەری دەبێتە حاکمی رواندوز..[١٤] تا دوای کوشتنی دوو کوڕەکەی[١٥] باویل ئاغە ! هەروەها بە دەنگی خەڵکەکە لە ئەنجوومەنی نیابی هەلبژاردراوە.

سمایل بەگی کوژراو هەردەم بە خۆزگەی پێشکەوتنی نەتەوەکەی بووە، زۆر دەردەســەری لەو ڕێگایــەوە بینیــوە، ئــەو خــۆزگــەو هــەولدانــەشی وەك ئەستێرەیەکی گەش لە لاپەڕەکانی مێژووی ئەنجوومەنی نیابی دەدرەوشێتەوەو دوژمنانی داگیرکەر دانیان بە کوردایەتی ئەو جــوانەمــەرگە نــاوە، هەر بــەوە ڕانەوەستاوە، بەڵکو لە دەرەوەی کۆبوونەوەکانی ئەبخوومەنیش هەولی مــافو خۆزگەی رەشو ڕووتی میللەتەکەی داوە، بە تایبەت پێشنیارە[١٦] بە ناوبانگەکەی شوباتی ساڵی ١٩٢٩ لە گەڵ چەندان سەرەكو ناودارى کورد وەك حازم شەمدین ئاغەو جەمال بابانی دوا سەرەك وەزیرانی پادشایی عیراقو چەندانی تر، بــۆ فەیسەلی پادشاو نوێنەری بەریتانیا، بۆ دامەزراندنی دەزگایەکی (وحدة) ئیداری سەربەخۆ بۆ کوردستان کە سەرۆکەکەی پیاوێکی لێ هاتووی کورد بێو هــەر ئەویش پەیوەندی ئەو دەزگایەو حوکــومەتی مــەلبەنــدی (المراکـز) بێ، بەلام دوژمنان ئەو جۆرە خۆزگانەیان بە زیندوویەتی گۆڕەشار کردوە.

دوا بە دوای ئەمەیش بۆ چەندان جاری تر دەستی لە نێو دەستی[١٧] ئەو کەسانە ناوە کە بە خۆزگەی سەربەخۆیی نەتەوەکەی هەولی داوە، بۆ نموونە لە گەڵ سەیــد تەهــا شەمــزینی لە ساڵەکــانی ١٩٢٣ ـ ١٩٢٨ بەلام هــەر وەك

خۆزگەکانی تر جوانە مەرگ بوون، تا لە ئەنجامدا بە هاندانی دوژمنان لە مەیدانی کورد پەروەری بە یەکجاری لە ناو دەبردرێ وەك هەزارانی تر.[18]

«بەژنێ سمایل ئاغەم دارێی مینایە
جوابەکێ بەرن لە بۆ بەغدایە
لعلی دەگرێی کوری کوژرایە
بەژنێ سمایل ئاغەم دارێی مێکوکێ
جوابەکێ ببەن لە بۆ کەرکوکێ
لعلی دەگرێی لە خۆم بێ بووکێ»[19]

## نوری ئاغە کێیە ؟

**مێجر هی دەڵێ:**

**«لەو کاتەی کەڕامەوەو کوردستان کەوتە پشتم، لە ڕێگا بیرم لەو خاڵو میللەتە دەکردەوە، هەموو شتێك بەولاوە نوری بە تەنیا بەم لاوە ! بە ڕاستی جێگای سەرسوڕمان بوو، نەك بۆ من، بەڵکو هەموو کاربەدەستانی ئینگلیز، ئەو پیاوە زۆر سەیر بوو ! سەرۆکایەتی نەدەویست، دارودەستەی زۆر نەبوو، پارەو پوولیش هیچ، بەڵام ئازاو مەرد[20] بوو، ژیانی بێ شەڕو شۆڕی نەدەویست ! هەرەسانی لە ئینگلیز هەڵگرتبو، دەبێ ئێستا لە کام شاخ و دۆڵ بێ ؟».**

نوری کوڕی باویل ئاغەی مەلا عەزیزی مەلا عەبدوڵڵایە لە ساڵی ١٨٩٢ لە هەمان ناوچەی سمایل بەگ چاوی هەڵێناوەو هەروەك ئەو بە ئاوو هەوای کوردستان فرچی گرتبو، لەو ڕۆژەیەوە نوری هەستی بە چاك و خراپە کردوە بە هیوای سەرفرازی خۆیی و ناوچەو میللەتەکەی بووە، بۆیە هەر لە زوویێکەوە بۆ هێنانە دی مەبەست ئاشنایی لە گەڵ تفەنگ و خەنجەر و جۆرە چەکەکانی تر پەیدا کردوەو ئەو ڕێگایەی پێ پەسند بووە.

ئەگەر بێتو چاو بە لاپەڕەکانی مێژووی ژیانی ئەو تاکە قارەمانە بخشێنین

بریتی‌یە لە ئەشقیایی، ڕاکردن، برسیەتی، بۆسە، شۆڕشی شێخ مەحمود، شۆڕشی ١٩٢٠، ١٩٣٢، ١٩٤٣، ١٩٤٥، شەڕی ئاکرێ، ڕانیە، باتاس، جەرگ سووتان، بێکەسی، دادگا، بەندیخانە، پشوودانێکی کورت، ئەیلول، نەخۆشی، گۆڕستانی گەردە گەرد.

ئەگەر ئەوە ژیانی مرۆڤێکی کوردی سەدەی بیستەم بێ، دەبێ بە چەندان کتێب کۆتایی بە سەربردەی ژیانی بێ ؟ لە ڕاستیدا زۆر، بەڵام لێرەدا لەسەر ئەو لایانە دەدوێین کە پەیوەندی بە مەبەستەکەمانە.

نەك لەو ڕۆژەی داگیرکەرانی ئینگلیز گەیشتە ناوچەی ڕواندوز، نوری ئاغە ئەشقیا بووە، بەڵکو لە زەمانی دەسەلاتی عوسمانیەکانیش ـ لەو بڕوایە دام ئەگەر بێتو ئەو شۆڕشگێرە[٢١] تا ئێستا مابوایە دەیتوانی پان و درێژی کوردستان بە میللەترمان بۆ بژمێرێ ـ بەڵام باوکی نوری بە خۆزگەی دەرباز کردن و هێور کردنەوەی کوڕەکەی پەنا دەباتە بەر کاربەدەستانی ئینگلیز بۆ لێبووردنی، بۆیە ئەوانیش دەرگای بۆ واڵا دەکەنەوەو پلەی ئەفسەری لە هێزی جەندرمەی ڕواندوزی پێشکەش دەکەن ! بەڵام نوری ئاغە توانای سەرشۆڕ کردنی بۆ فەرمانە قورسەکانی داگیرکەران نەبووە ! بۆیە هێندەی پێ ناچێ دەست و بازووی هەڵدەکاو بەرەو چیا بۆی دەردەچێ و چەند کەسانێك لە دەوروبەری کۆدەبێتەوە، هێرش لەسەر هێرش، بۆسە لەدوا بۆسە[٢٢] تا لە ساڵی ١٩٢٠ ڕواندوز لە دەست ئینگلیز ڕزگار دەکات و دەبێتە میرکوڕ، بەڵام ئەوەندەی پێ ناچێ بۆ جاری دووەم دەگیرێ و ڕەوانەی دادگای هەولێر دەکرێ.. لەوێوە بۆ کەرکوك ئینجا بەغدا، بەڵام لە ڕێگادا بۆی دەردەچێ و لە دەست پاسەوانەکان دەرباز دەبێ، ئینجا دەگەڕێتەوە چیا بۆ تۆڵەکردنەوە، تا لە ئەنجامدا بە هاندانی دوژمنان، برینی کۆنی نوێی دەکرێتەوە بۆ وازهێنانی لە مەسەلە سەرەکی‌یەکەو تۆڵە کردنەوەی خوێنی لە سمایل بەگی هاودەنگی.

## کارەساتەکە..

سەعید بەگ کوڕی عەبدوڵلا پاشا پیاوێکی کاربەدەست و تاکە دەوڵەمەندی ناوچەی هەریرو باتاس و ڕواندوز بووە، هەروەها بنەماڵەی سلیمانی عەلی حەیدەری خاڵوانی مندالانی باویل ئاغە لە سەعید بەگ کەمتر نەبوون، بۆیە

ناخۆشیان دەکەوێتە نێوان لە ئەنجامدا سەعید بەگ لە نزیك مزگەوتی باتاس دەکوژن، لەو کاتەی سمایل بەگ دەبێتە حاکمی رواندوز دوو براو منداڵێکی نوری ئاغە دەکوژرێن و دەکەوێتە ئەستۆی سمایل بەگ.

لە ۱۹۳۲/۱۱/۲ لە شاری هەولێردا.. صباح نوري باویل ئاغە هێرش دەکاتە سەر سمایل بەگ و دوو گوللەی لێدەدوا لە خوێنی دەگەوزێنێ و بەرەو ماڵی کەریم کورەچی[٢٣] ڕادەکا، لەو کاتەدا سەلیم خەیات موسلاوی کە (دیان) بووەو سەرۆکی تەندروستی هەولێر بووە، سمایل بەگ دەگەیەنە تە بەغدا، لە ئەنجامدا چاك دەبێتەوە، هێندەی پێ ناچێ مەلا ئەفەندی هەولێری دەکەوێتە نێوانیان و لە ماڵی ئەوا ئاش دەبنەوەو سمایل بەگ دەڵێ: «هەر چەندە دەستم لە کشوتنی مستەفاو کەریم نیە بەڵام با ئەو دوو گوللەیە ببێتە تۆڵەی ئەو دوو مەرگانە، ئینجا بۆ بەیانی هەموویان دێنە دادگاو لە بەردەم مستەفا قەرەداخی حاکم لە ماڤی خۆی واز دێنی، بەڵام قەرەداخی رازی نابێ و حەوت ساڵ بەندی بۆ صباح نوری ئاغە دەبڕێتەوە.

نوری ئاغە قومیسەر بووە لە دهۆك، بەڵام دەگەڕێتەوە لای دایکی لە گوندی (جوڵە مێرگ)) بۆ ئەوەی لەو ئازارەی هێمن و هێوری بماتەوە، لە کاتی کەیشتنی نوری ئاغە.. خزمەکانی وەك خدر ئاغەی سوورچی کە زاواو خەزوورن لە گەڵ ئیبراهیمی پیاوی خدر ئاغەو حەسەنی حاجی عەبدول ڕەزاق و مەلا عەزیزو عەلی باویل ئاغە بەشداری نوری ئاغە دەکەن لە نان خواردنی ئێوارە، بۆ بەیانی نوری ئاغە دەیەوێ بگەڕێتەوە دهۆك.. خزمەکانی تا سەر ڕێگای خەلیفان لە گەلی دێن، سمایل بەگیش لە هەمان شەو مێوانی ماڵی میرانەکانی شەقلاوە دەبێ چونکە بووریکی -کچی عەبدوڵڵا پاشا- خێزانی رەشید میران دەبێ.

بۆ بەیانی ئەویش لە گەڵ هەواڵەکانی خۆی دەیەوێ بگەڕێتەوە رواندوز.. هەرچەندە میران پێی دەڵێ مەڕۆ، بەڵام لەوە دڵنیا بوو کە هیچ شتێك لە نێوانیان نەماوە بۆیە بەڕێ دەکەوێ، ئۆتۆمبێلی خولامەکان لە پێشەوە خۆیشی لە دواوە بەرەو رواندوز دێن، کاتێ ئۆتۆمبێلی خولامەکان دەگاتە نزیك نوری و خزمەکانی.. وا دەزانن بۆ ئەوان راوەستاون بۆیە دەست وەکەری دەکەن -هەر چەندە عەلی باویل ئاغە دەڵێ: ئێمە بۆ بەڕێ کردنی نوری برام لەوێ راوەستا بووین بەڵام کار لە کار ترازا- بوو بە شەڕ[٢٤] لە ئەنجامدا سمایل بەگ و حسین مەلا ئەحمەد بلەیی و غەفور رواندوزی و حەسەن عەبدوڵڵاو حەسن و قادر دەکوژرێن و سولەیمان بەگی دەرگەلەیی بریندار دەبێ، مامۆ رواندوزیش بۆی دەردەچێ و

هەڵدێ ! لە وانیش مەلا عەزیزی کوڕی باویل ئاغەو حەسەنی حاجی عەبدول ڕەزاق دەکوژرێن و عەلی و نوری باویل ئاغەو سەلیمی حەمەدەشین بریندار دەبن، لە ئەنجامدا هەموویان دەگیرێن و بەندی بیستساڵیان بۆ دەبڕێتەوە لە دادگای موسل لە قەزیەی ۲ ج ۹۳٤ بە تاوانی کوشتن، بەڵام لە کاتی تەمیز کردنیان لە ۱۹/۲/۹۳٤ دوانیان بەندی هەتا هەتایە ئەوانی تریش چەند ساڵێك بەند، گرتنەکەشیان لە ڕۆژی کوشتن ۸/۶/۱۹۳۳ بۆ حیساب دەکرێ، لە دوای هەشت ساڵ بەند، واتە لە ساڵی ۱۹٤۱ لە کاتی شەڕی (حەبانیە) بە فەرمانی پادشایی بە یارمەتی یونس سەبعاوی وڵاش زاوای خالی نوری ئاغە لە بەندیخانە دەردەچن صباحی کوڕی نوریش دەبێتە یاوری یونس سەبعاوی و لە هەمان ساڵ دەکوژرێ، ئەو کارەاستە خەمناك و دل تەزێنە تەشنە دەکا تا لە ساڵی ۱۹٤۷ لە هەریر سمکۆی نوری ئاغە دەکوژن، ئەوانیش لە ساڵی ۱۹٦۱ یەکێکی تر لە جیاتی سمکۆ دەکوژنەوە، بە ڕاستی کارێکی نائەموار و ناڕێکە و جێگای کەسەرو داخە.

«وەی شەڕە شەڕە وەی شەڕە شەڕە
بەرێ چەندم گۆ شەڕە، شەڕ لە چیابە
شەڕی صباحی و سمایل پاشایە
صباح منداره لە مەکتەب دایە
سمایل بەگ وا دێ هەر وەکی بایە
لەگە مەعاونی[۲۵] دەستیان تێك دایە»[۲٦]

## ئەنجام..

دەربارەی کارەساتەکە هەر وەکو وتمان کەسەرێکی شووەمەو جێگای شانازی نەتەوەکەمان نیەو لە ئەنجامی داب و نەریتی کۆن و بۆگەن قەوماوە، سەرەڕای ئاگر خۆشکەران و دوژمنان.. چونکە ئەو کارەساتەو چەندانی تر بووبە هۆی دواخستن و پێش نەکەوتنی ناوچەکە بە تایبەت شارە خنجیلانەکەو پەربووتەکەی کورد کە لە دێرزەمانەوە وەك ئەستێرەیەکی گەش لە ئاسمانی مێژووی نەتەوەی کورد دەدرەوشێتەوە.

ڕەواندوزی شانـازیو پایتـەختی میرانی سـۆرانو ئاواتو ئـارەزووی قیبلەگایەکی کورد لە دێرزەمانەوە پێش لە دایك بوونی حەزرەتی عیساوە بۆتە بێ شێلی پۆستاڵی ئەرتەشی شاهنشاکانی فارسو جبەلەبەرەکانی عوسمانیو کلاو پانەکانی ئینگلیز.

ڕۆڵەی کـورد بە گشتیو ڕوانـدوزی بە تـایبەت هـەردەم بە خـۆزگەی سەرفرازیو پێشکەوتنی خەڵكو شارەکەیان بوونـە، بۆیـە هەر یـەکەیـان بەو خۆزگەیەوە دەستی یارمەتیان بۆ سولتانی شمشێر درێژ کردوە، بەلام سولتانەکان لە سەرەتاوە بە قسەی لووسو مـەکربـازیو لە دوایشدا بـڕینی ئەو دەستـە خاوێنانەی کە ڕۆژێك لە ڕۆژان بۆ خزمەت کردنیان درێژ کرابوو.[٣٧]

هیچی ترمان بێ نەماوە جگە لەوەی کە بلێین هەزاران سـلاوو چەپکێـك نێرگزی پاڵ شاخەکانی کوردستان بـۆ گیانی ئـەو کەسـانە کـە بە خـۆزگەی سەرفرازی کوردو کوردستان سەریان ناوەتەوە ژێر گڵ.

## سەرچاوەکان


١ ـ مێژووی میرانی سۆران، خوا لێ خۆشبو حوزنی موکریانی.
٢ ـ سنتان في کردستان، میجر هی
٣ ـ طریق في کردستان، هاملتون
٤ ـ ماساة بارزان المظلومة، معروف جیاووك
٥ ـ لیرەیەك لە گەنجینەی نەتەوەی کورد، ئەسعەد عەدۆ
٦ ـ دانیشتن لە گەڵ: خانم سوورچی، عەلی باویل ئاغە، اسماعیل سەرهەنگ، اسماعیل گرتکی، عزالدین فیضیو چەندانی نەناسراو.


## پەراوێزەکان

١ ـ ئەم باسەم لە ڕۆژی ١٩٨٥/٢/١٦ لە وەرزی ڕۆشنبیریی یـەکێتی ی ئەدیبو نووسەرانی لقی هەولێردا بە کۆڕ پێشکەش کرد.

٢ ـ لعلی خان کچی مستەفا ئەلیاس، لە ساڵی ١٨٨٤ لە دایك بووەو لە ١٩٦٨/٣/٧ مردوە، ئەم ئافرەتە دایکی سمایل بەگە، لە دوای کوشتنی تاکە کوڕەکەی بۆ ماوەی سی‌ی ساڵ نەچوّتە ژووری تایبەتی سمایل بەگی کوڕی، بەلام مستەفا ئاغەی رواندوزی برازای کە لە دەوروبەری مانگی ئاداری ساڵی ١٩٨٥ مرد، دەهێنێتەوە سەر ماڵی خۆی.

٣ ـ سمایل بەگ کوڕی سەعید بەگ، لە ساڵی ١٩٠٠ لە دایك بووەو لە ١٩٣٣/٦/٨ لە دۆلی نیشلوێ کە دەکەوێتە سەر ڕێگای خەلیفان ـ سپیلك لە ژێر گوندی (سەرچیا) کوژراوە، هەر چەندە لە کتێبەکەم لیرەیەك لە گەنجینەی نەتەوەی کورد، پەروایزی (١٣) ساڵی (١٨٩٧)م، کردوّتە ساڵی لە دایك بوونی، بەلام خوا لێ خۆشبو مەعرووف جیاووك لە کتێبەکەی دا دەڵێ: «لەو کاتەی سەعید بەگ کوژرا.. سمایل بەگی کوڕی تەمەنی ١٤ ـ ١٥ ساڵ بووە»، هەروەها مێجر هی دەڵێ: «کاتێ سەرۆك هۆزەکان بڕیاریان لەسەر حاکملیەتی سمایل بەگ دا تەمەنی ١٩ ـ ٢٠ ساڵ بوو».

سەعید بەگی باوکی لە سەرەتای ساڵی ١٩١٨ پێش گەیشتنی داگیرکەرانی ئینگلیز بۆ ناوچەکە.. کوژرا، بە مەبەستی دیار کردنی تەمەنی سمایل بەگ زۆر گەڕام، بەلام داخی گرانم نێوی لە هیچ شوێنێك نەبوو چونکە عیراق لە ساڵی ١٩٣٤ سەرژمێر کراوە، ئەویش لەو ساڵەدا نەماوە.. بۆیە بە مەزندەو دیدەنی چەندان بەساڵا چووی ناوچەکەو تەماشا کردنم بۆ وێنەکانی جیا جیای سمایل بەگ ساڵی دیارکراوم پێ پەسندو نزیك تر بوو.

٤ ـ دەربارەی بنەماڵەی سمایل بەگ، خوا لێ خۆشبو حوزنی موکریانی دەڵێ: «بنەماڵەی سمایل بەگ پێش کوێر پاشای رواندوزی لە میرانی سۆران جیا بوونەتەوە، بەلام مێجر هی دەڵێ: «یەحیا بەگی مودیر ناحیەی دێرە هەریر، کوڕەزای ڕەسوول مستەفا پاشا، کوڕی کچی عەبدوڵلا پاشای باپیرەی سمایل بەگە»، هەروەها دەڵێ: «یەحیا بەگەو سمایل بەگ ئامۆزای یەکترن»، دووبارە موکریانی دەڵێ: «کاتێ میر محەمەدی رواندوزی هێرشی بردە سەر مامەکانی.. بایز بەگی باپشتیان، برا گەورەی عەبدوڵلا پاشا، عوسمانیەکانی خۆش دەویست لە ترسی میر محەمەد ڕای کردە ئەستەمبوڵو لە زەمانی ڕەسوول پاشا گەڕایەوە رواندوز»، لێرەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە بنەماڵەی سمایل بەگ لە میرەکانی سۆرانن، بۆ ؟ ئەگەر وانەبێ بۆ بایز بەگ لە هێرش کوێر پاشا بۆ سەر مامەکانی دەترسا ؟ ئەگەر لە مامەکانی نەبێ ؟!.

٥ ـ لە کورد پەروەری ئەم لاوە، هاملتون دەڵێ: «سمایل بەگ هەردەم بە ئاواتی پێشکەوتن‌و سەربەخۆیی کوردستان بوو، لە لای ئێمەی دەوت ـ واتە ئینگلیز ـ دەبێ ڕۆژێك دابێ لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست کوردستان وەك (سویسرا) ی، ئۆرپای لێ‌بێ ! هەروەها لەو بیرو باوەڕە دا بوو، بە کردنەوەی ڕێگای گەلی عەلی بەگ ئاواتەکەی دێتە دی، بۆیە هەردەم دەستی یارمەتی بۆمان درێژ دەکرد».

٦ ـ له بارەی داواکەریکی سەربەخۆیی کوردستان، خوالێ خۆشبو جیلووک دەڵێ: «کاتێ جەعفەر پاشا وەکیلر سەرەك وەزیران و مێجر یانغی وەکیـل نوێنـەری سامی هـاتنە هەولێر، بۆ ئەوەی ئەبزی خەڵکـەکە وەربگـرن دەربارەی پـەیمانی سـاڵی ۱۹۳۰، له دانیشتنێکدا جەعفەر پاشا پرسیاری له خدر ئەحمەد پاشای دزەیی کردو گوتی: چی‌تان دەوێ ؟ ئەویش واتە دزەیی وتی: خەڵکی سلێمانی چی‌یان دەوێ ئێمەیش ئەوەمان دەوێ ! بێ ئـەوەی پرسیـار له سمایـل بەگ بکـرێ، هەڵسـایەوە سـەرپێ‌و گـوتی: سەربەخۆیی‌یەکی تەواوی کوردستانمان دەوێ، جەعفەر پاشاش بە هاوار کردن پێ‌ی وت: دانیشە تۆ بچوکی نازانی چی‌تـان دەوێ ! ئینجا ڕووی له ئـەحمەد عـوسمان ئەفندی کـرد.. ئەویش هـەمان وەڵامی دزەیی دایـەوە ! جەعفـەر پاشـاش دەڵێ: تۆ نوێنەری ئەنجومەنی نیابی چۆن قسەی ئەوان دەکەی ؟».

٧ ـ مەبەست له ناجی شەوکەتی وەزیری ناوەخۆیی پادشایی‌یە.

٨ ـ بۆ تەواوی دەقی لاوکەکە بڕوانە لیرەیەك لاپەڕە ٥٣ ـ ٥٨.

٩ ـ ئەوەندەی من بزانم جگە له مامۆستا محەمەدی مەلا کریم کەسی تر لاوکی لعلی‌خان، یان نوری باویل ئاغەی بڵاو نەکردۆتەوە، له مێژوو نووسانیش هەر ئەم کتێبانەی ناوم بردوون له سەرچاوەکان زیاترم نەدیومو نەبیستووە.

١٠ ـ لێرەدا دەمەوێ ئەم تۆڵەکردنەوەیە بە قسـەی قارەمـانێکی عەرەبی نێـو ابو القـاسم ببەستمـەوە بۆ بـەچێژ کـردنی قسەی خـۆم ! لەو کاتـەی ئیسپـانیـەکـان دەوروپشتی شاری ئەندەلسیان گەمارۆدا بـوو، والیی ئەنـدەلس لەسەر ئـەوە پێك هاتبوو کە کلیلی شار بداتە دەست له پاش ئەوەی خەڵکەکەی لێ چۆڵ بکرێ، له دوا دوای چۆڵ کردن.. ئافرەتێکی عارەب هاتە سەر ڕێگای ابو القاسمی پاڵەوان‌و پێ‌ی گوت: دەمێکە ئارەزووی ئەوە بووم کە بمخوازی ! ئەو خۆزگەیەم نەهاتـە دی، بەڵام لەم کاتەدا داوا کارم خۆزگەم بهێنیە دی ! ئەویش پێ‌ی وت: یەك پرسیارم هەیە ئـەگەر وەڵامت دامەوە، ئەوە له گەڵ خۆمت دەبەم.

ـ فەرموو
ـ ئایا دڵت جێگای قینی هەیە ؟
ـ ئا توو ئەو خودایە ئەمە پرسیارە، له ئافرەتێکی عارەبی ئەندەلس بکرێ ؟ ئەگەر ئەو دڵەی کە توێ خۆشەویستی تیایە شوێنی قینی دوژمنانی تیا نەبێ له ژێر پامی دەنێم !.
ـ سوپاس بۆ یەزدان، دەستت بخە دەستم بۆ ئەوەی له دوای خۆمت سوار بکەم.

١١ ـ بڕوانە سەرچاوەی پێشوو.

١٢ ـ دەربارەی خوێندنی سمایل بەگ، عەلی باویل ئاغە دەڵێ: «سمایل‌و هاوتەمەنەکانی

وەك نوری برامو دوایی منیش لە مەدرەسەی روشدیە بە زمانی تورکی خوێندومانە.

١٣ - هەرچەندە بنەماڵەی باویل ئاغە دەستیان لە کوشتنی سەعید بەگ نەبووە، بەڵکو ماڵی خاڵوانیان بوون، کەچی ئاگری دوژمنداری ئەوانی گرتەوە.

١٤ - مێجر هی دەڵێ: «کاتێ بە شێخ محەمەد ئاغەی باڵەکیم وت: تۆم هەڵبژاردوە بۆ حاکماتی رواندوز.. قسەکەمی پەسند نەکردو گوتی: سمایل بەگ شیاوی ئەو شوێنەیە، منیش بۆ ئێوارە سەرۆکەکانم کۆکردەوە، هەموویان بڕیاریان لەسەر سمایل بەگ بوو، بەڵام پێم خۆش نەبوو چونکە جحێڵ بوو، ئەو کارەش لە ئەو بەرز تر بوو، بەڵام چارە ؟».

١٥ - دەربارەی کوشتنی دوو کوڕەکەی باویل ئاغە، هاملتون دەڵێ: «لەو کاتەی نوری ئاغە لە دەست جەندرمەکان.. لە رێگای بەغدا دەربازی بوو، باوکیان بەند کردو هەوڵی گرتنی چوار براکانیان‌دا لە رێگای سمایل بەگی حاکم، بەڵام براکانی نوری ئاغە خۆیان نەدا دەست، لە ئەنجامدا مستەفاو کەریم کوڕانی باویل ئاغە کوژران‌و منداڵێکی بچوکی نوری ئاغەش جا لەبەر ئەو هۆیەوە بێ، یان لەبەر نەخۆشی‌یەکەی لە ناوچوو !» ئەو کوشتارە خەلکەکەی لە سمایل بەگ کرد، هەر چەندە سمایل بەگ وەك لێپرسراوێك ئەرکی سەرشانی خۆی جێبەجێ کردوە، بەڵام کورد گوتەنی «ماڵ لە خۆڕا نەبوو میوانیش ووری ووری».

عەلی باویل ئاغە لە وەڵامی پرسیارێکمدا وتی: «لەم دواییەدا بۆمان دەرکەوت کە سمایل بەگ هیچ پەیوەندیەکی بە کوشتنی براکانم نەبووە، بەڵکو یەکێك لە خاڵوانەکانی کە نێوی عەویل ئاغە بوو».

١٦ - جیاووك دەڵێ: «لە دادگای هەولێر راوەستا بووم، کاتێ پێشنیارەکەیان بۆم ئێناو خوێندمەوەو گوتم: ئەو وەگێڕانەم بە دڵ نیە - بە مەزندەی جیاووك کارەکە لە پیلانی ئینگلیز بووە، کارەکەش جێگای مەترسی‌یە ! چونکە بەم پێشنیارە رێگا بە ئاسووری‌یەکان دەدەن لەسەر شانی کورد ئەوانیش دەولەتێك لە کوردستان دابمەزرێنن - لە کاتی خوێندنەوەی کتێبەکەی جیاووك، لەسەر ئەو پێشنیارە.. بە مەزندەی من هەست بە نەهێنی‌یەك دەکرێ ! کاتێ دەڵێ: سمایل بەگو جەماڵ بابان کە خۆیان بە سەرۆکی کوردان دادەنا هەرچەندە ئاواش نین، سمایل بەگ خۆی بە نەوەی کۆر پاشا دادەنێ کەچی وا نیە..... تاد.

بەش بە حاڵی خۆم پەیوەندیم بە ناخۆشی نێوان جیاووك‌و بابان نیە، چونکە جیاووك جەماڵ بە بابان دانانێ‌و دەست بۆ (زەهرەی) دایکی درێژ دەکا ! مەبەستی ئێمە سمایل بەگە.. بە مەزندە:

یەکەم - جیاووك خەڵکی گوندی سریشمەیە، کە سەر بە یەك ناوچەی ئیداری بووە، کە سمایل بەگ سەرۆکی بووەو لە پێشتر باوك‌و باپیرەی، ئەویش واتە جیاووك

به زرنگی خۆی تـوانیویـەتی جێگای خـۆی لە مێژووی سیـاسی عیراق بـە گشتیو کوردستان بە تایبەت بدۆزتەوە، سمایلیش جگە لە دەولەمەندیو عەشیرەکان زیاتری نەبووە.

دووەم ـ پرس نەکردن بە چیاووك، پێش نووسینی پێشنیارەکە لە لایەن سمایل بەگو برادەرەکانی ! لێرەدا وا دەگەینێ کە ئەویان بە یەکێکی سەرەکی لە مەسەلەکە دانەناوە.

سێیەم ـ دەبێ کوشتنی یوسف بەگی پالێوراوی حاکمی رواندوز بەر لە سمایل بەگ، هۆیەکی سەرەکی ئەو نەهێنییە بێ ؟ چونکە جیاووك بە دڵ سووتاوی لەسەر زمانی پووری.. باسی لە ناوچوونی یوسف بەگ دەکا ! هەرچەندە هەوڵی بێوچانمدا بۆ زانینی خزمایەتی یوسف بەگو جیاووك بەلام نەگەیشتمە ئەنجام.

چـوارەم ـ شانـازی کردنی جیـاووك بە ئیسـلامەتی خـۆییو رقێکی ئـاینی لە ئاسوریەکان، کەچی سمایل بەگ هەردەم هەوڵی ئەوەی داوە کە ئاسوریەکان وەك برای کوردی ئیسلام دەبێ لەسەر ئەم خاکە بژین، چونکە بە کوردییان لە قەڵەم دەدا.

١٧ ـ دەربارەی دەست لە نێو دەست نانی سمایل بەگ لە گەڵ داگیرکەران دەڵێین: ئەو گەنجە چەوساندنەوەی میللەتی کوردی لە ژێر دەسەلاتی عوسمانیەکانو وێران کردنی شارە خنجیلانەکەی رواندوز بە دەست قەیسەرییەکان، بە چاوی خۆی بینیووە، بۆیە لەسەر ئەو بیرو باوەرە بووە کە کورد بەهاتنی داگیرکەرانی ئینگلیز دەگاتە ئامانج، بۆیە هەر لە یەکەم رۆژی گەیشتنی کاربەدەستانی ئینگلیز بۆ رواندوز، پێشوازیانی کردوەو دەستی یارمەتی بۆ نوێ کردنەوەو دامەزراندنی دامودە زگای سـەرپەرشتی درێژ کردوەو لەو پەڕی دڵ خۆشیدا بووە کاتێ هەواڵی ڕێگا دروست کردنی گەلی عەلی بەگی بیستوە، بە ئومێدی ئەوە بووە کە قوتابخانەو نەخۆشخانەو پێشکـەوتن بەو ڕێگایە دەگاتە ناوچەکەیان، بەلام هێندەی پێ ناچێ لەو کاتەی ڕێگاکە بەرەو کۆتایی هاتووە.. ڕوو دەکاتە هاملتونو دەڵێ: کوا قسەکانتان ؟ کوا قوتابخانەو نەخۆشخانە، وا دەردەکەوێ ئەو ڕێگایە بۆ هاتنی سوپاو گواستنەوەی جبەخانە دروست کراوە ! لە لایەکی تر بەرانگار بوونی سمایل بەگ لە گەڵ کاربەدەستانی پادشایی، بە تایبەت لە کۆبوونەوەکانی ئەنجومەنی نیابی.. هەروەها گوێ نەدانی کاربەدەستانی ئینگلیز بە سمایل بەگو داواکانی، سەرەڕای دەرچوونی سەید تەهای شـەفرینی هـاوخەمی لە عیراقو مانەوەی ئەو لاوە بە تاکە سواری، ئەو هەموو خاڵانـە بوونـەتە هـۆی لە ناوچوونی ئەو کورد پەروەرە.

١٨ ـ پیلان دانانی ئینگلیز بۆ لە ناوبردنی ئەم داواکەرە دەڵێین: ئینگلیز سەدان بەڵکو هەزاران کەس وەك سمایلو شەفرینیو چەندان میللەتانیان نائومێد کرد، هەر ئەوان نەبوون لە بەڵێنی نامرۆڤانەیان سەید تەهلو نزیکەی حەفتاو پێنج هەزار فەلەیان لە شوێنو جێگای خۆیان هەڵکەناندو بەو شاخو دۆڵانەی کوردستانیان بلاوە پێ کردن، بە

# عبد الرحيم ڕەحميێ
# هەكارى و
# چەند هوزانەك

□ عبدالكريم فندي دوسكي □

عبد الرحيم رەحميێ هەكارى يەك ژ نڤيسەرو هوزانڤانێد گوڤارا «ژين» ێ بويە د دەمێ دەرگەتنا وێدا. ئەز دشێم بێژم هەمى ژمارێد ڤێ كوڤارێ هاتينە خەملاندن ب هوزان و نڤيسينێد وى. براستى ئەگەر هزرا خوە تێدا بكەين بيهنا ئەڤينا مللەتى ژێ دفڕيت.

ع - رەحيمى هەكارى مروڤەكێ نيشتمان پەروەر بريە، چتكو مشە تاڤێ وى دگەل ئەندام و دەستەكێد كومەلێد كوردى لوى دەمى تێت. هەر وسا نڤيسەرەكێ ب راهاڤێژو قەلەم خورت بويە هەر وەكو ژ نڤيسينێد وى ئاشكەرا دبيت. هوزانڤانێ هێژا **«جەگەرخوين»** چەند گرێكێد ژينا وى ڤەدكەت و دبێت عبد الرحيم هەكارى شاعرەكێ كوردە بەرى چەند سالا ل ئەستاميولێ دونيا رون لێ تارى بويەو ديوانەكا ب كورمانجى هەى و ل ستامولێ هاتيە چاپكرن[1]. هەر وسا ديوانا جزيرى وى يا چاپكرى. ع. رەحمى هەكارى ژ نەڤيێد هوزانڤانێ كورد **«پەرتەو پاشاێ هەكارى»** يە و بنەمالا ميرێد هەكاريا يە[2].

مێژونڤيسێ هێژا د. كمال مظهر دبێت: هەكارى ئێكە ژ بەراهيێد روژنامە نڤيسێد كورد لسەر دەمێ خوەد هەمى ژمارێد **«ژين»** ێ دا شعرێد پڕ هەستێ

ئاواتی گەیشتنە ئامانجی ئەو ڕەش‌و ڕووتانە ! چەندان ئۆردگای سەربازی بە نێوی سوپای لیفی لەو هەڵخەڵەتاوانەی بە قسەی مار شەمعون‌و گەورەکانی پڕ کردەوە. لە دواییدا هەر یەکەیان بە دەردێك ئاوارە کردو لە ناویان بردن. هەر سەید تەها نەبوو بەو دەردەوە لە تاران بە نائومێدی‌و شەرمەزاری لە غەریبایەتی سەری نایەوە ژێر گڵ. هەرچەندە سەید تەهاو سمایل بەگ هەوڵێکی زۆریاندا بۆ ئەوەی کوشتار لە نێوان کوردەکانی فەلەو ئیسلام بەرپا نەبێ. بەلام پیلانی رابووردوی عوسمانیەکان لە گەڵ سمکۆی شکاك‌و پیلانی ئینگلیز لە گەڵ ئەو دەوەدا هەردەم وەك نائینسانی ئەوان بەهێز تر بووە، کەچی لە پاش ئەو بارە نائەموارەش لە کاتی ئاوارە بوونی فەلەکان بۆ شاری بەعقووبە.. سەید تەها هەوڵ‌و تەقەلایەکی زۆر باشی داوە بۆ گەڕانەوەی سەدان ماڵی برا فەلەکان کە هەردەم وەك برا لەسەر ئەم خاکە دەژیان‌و هەروەها یارمەتی دانیان بۆ دامەزراندنی کلیسەی رۆژهەلاتی لە هەریر بە ڕابەری مار یوسف‌و ئاسایش‌و برایەتی لە نێوان فەلەو ئیسلام بچەسپێنێ کە تا ئێستا نموونەی شانازی نەتەوەکەمانە. ئایا دوژمن‌و داگیرکەران ئەو برایەتیان دەخواست. نەخێر بەلام ئەوەیش دەگەڕێتەوە سەر هەستی مرۆڤانەی نەتەوەی کورد.

١٩ ـ بڕوانە سەرچاوەی پێشوو لاپەرە ٥٨ ـ ٥٩.

٢٠ ـ دەربارەی ئازایەتی‌و دڕندەیی نوری ئاغە.. عەلی باویل ئاغە دەڵێ: بە مەزندەی خۆم ئەو ناوەی کە بە دوای ئێمە کەوتووە کە ئازایین، دڕندە، مەرد، دەگەڕێتەوە ئازایەتی خاڵوانمان کە یەزیدین، چونکە داپیرەم بووك مێم کچی عەلی بەگی داسنی یەزیدی‌یەو کە دەکاتە خوشکی بووك عایشی خێزانی رەسول پاشا. ئەو دوو خوشکە بە دیلی دەهێنرێنە رواندوز. میر محەمەدیش یەکیان لە رەسولی برای مارە دەکات‌و ئەوی تریش لە مەلا عەزیزی باپیرەم کە فەقێ‌یەکی ناوبانگ بووە. سەرەڕای ئەوەی کە خزمایەتی لە گەڵ رەشا ئاغە کە یەکێك بووە لە سەرکردەکانی سوپای سۆران.

٢١ ـ رەنگە هەندێ کەس گلەیی بکەن‌و بڵێن: چۆن بەو جۆرە کەسانە دەڵێن شۆرشگێر. منیش دەڵێم نابێ ئەوە لە یاد بکەین کە نوری ئاغە لە ساڵی ١٩٦٢ لە تەمەنی (٧٠) ساڵیدا بە چاوی کەم بینایی‌و کەڕی، بە سواری ئەسپێکی ڕەسەن گەیشتۆتە بنکەی شۆڕشگێران، بە مەبەستی بەشدار کردن، بەلام دەردە پیری بەرەو نەخۆشخانەی هەولێری دەبات‌و هەر لەوێ لە رۆژی ١٩٦٣/٢/٧ کۆچی دوای دەکات لە گەردە گەردی رواندوز دەنێژرێ.

٢٢ ـ کاتێ نوری ئاغە لە دەست جەندرمەکان دەرباز بووە، لە ڕێگای سولەیمانیەوە گەیشتە شاخەکانی رواندوز. لە رۆژی ١٩٢٠/٨/١٢ لە گەڵ خدر ئاغەی حەمەدەشینی سورچی‌و چەندانی تر دێنە گەلی عەلی بەگ‌و لە نزیك بەردی (بازنان) بۆسەیان بۆ لە ناوبردنی مێجر هی دامەزراند. بەلام گەیشتنی یارمەتی بۆ هی بوو بە هۆی رزگار بوونی لە دەست نوری ئاغە. بەلام عەلی باویل ئاغە تەمەن (٧٣) ساڵ دەڵێ: لەو

بۆسەیەدا نوری لە گەڵ نەبوو، بەڵکو خدر ئاغەی زاوامانو شێخیل دەستیلۆکی بوو، ئەمما مەسەلەی گرتنی رواندوز، نوری ئاغەو خدر ئاغەو برادەرەکانی دەکەنە بنکەی شۆرشگیرانی ئلوچەی ئاکرێ بۆ لای شێخ هوبێدەڵلای سورچی بادینی، ئینجا هێرش دەکەنە سەر باتاس، ئەفسەری ئینگلیز کە ناوی (لیمنکتن) دەبێ، لە گەڵ سەد جەندرمە بەرانگاریان دەبن، بەڵام هاریکاری عەشایری خۆشناوەتی لە شەقلاوە بۆ شۆرشگێران دەبێتە هۆی شکانی ئینگلیزو لە دواییدا رزگار کردنی رواندوز؛ دەربارەی گرتنو هەلاتنی نوری ئاغە ئەوەمان دەستگیر کەوتوە، لە شەوێکدا نوریو خدر پەلاماری دەزگایەکی ئینگلیزیان داوە، لە ئەبخامدا نوری ئاغە بە دیل گیراوەو نێردراوەتە هەولێر، بۆ مەحاکەمە کردنی، هەروەها داوا کردنی حاکمی ئینگلیز لە سمایل بەگ بۆ ناردنی دوو شاهێد، ئەویش ـ بە داخەوە ـ خورشید بەگی برای فاتمە خانی سەرۆکی (فەقێیان)و عەولا ئاغەی (کەرەوان) ی، ناردوە.

بەڵام هی دەڵێ: بەوەش توانای چەسپاندنی توهمەمان پێ نەکرا، چونکە نوری زۆر زرنگەو قسە زان بوو، بەڵام دۆزینەوەی نامەی شێخ عوبێدەڵلای سورچی شۆرشگێر لە ماڵی نوری ئاغە بووە هۆی نیشانەی بەشدار کردنی لە گەڵ شۆرشگێران دژ بە ئینگلیز، ئینجا ماوەی پێنج ساڵ بەندی بۆ برپاوەو رەوانەی بەغدا کرا، بەڵام لە رێگادا جەندرمەیەکی عارەب کە نێوی محەمەد بووە لە گەڵ هاورێیەکی تری کە نێوی مەلا حەبیب شنۆیی بووە، ئەفسەرەکەیان یوسف کەشاف دەکوژنو لە گەڵ نوری رادەکەن، باویل ئاغەش لە چاکەی محەمەد عارەب، خێزانی مستەفای کوری کە بێوەژن بوو دەداتە محەمەد کە تا ئێستا منداڵەکانی لە گوندی سەرچیا دەژین.

٢٣ ـ کەریم کوری وەلی حاجی عوسمان کورەچییە، کەریم دوو کوری لە پاش بەجێ ماوە، خالصو چۆلی، چەند مانگێك لەمەوبەر چۆلی مرد ! خالص دەڵێ: لەو کاتەی باوکم مرد تەمەنم حەوت ساڵ بوو، خۆیش مەوالید ١٩٣٧ واتە کەریمی باوکی لە ساڵی ١٩٤٤ مردوە، هەروەها خەدیجە خانی خێزانی نوری ئاغە کچی سەلیم کورەچییەو ئامۆزای کەریم کورەچییە.

٢٤ ـ لە لایەکی تر دەڵێن: گوایە بنەماڵەی باویل ئاغە بۆسەیان دانلوەتەوە، بروانە سەرچاوەی پێشوو لاپەرە ٢٣ ـ ٥٥.

٢٥ ـ لەو کاتەی سمایل بەگ بریندار بوو بە دەستی صباح نوری ئاغە لەگەڵ سەعید قەزازی مودیر تەحریراتو محسن ئاغەی سەرۆك شارەوانی هەولێر دا بوو.

٢٦ ـ بروانە سەرچاوەی پێشوو لاپەرە ٥٨ ـ ٥٩.

٢٧ ـ دەربارەی سەید تەهاو فەلەکان، هەر چەندە سەید تەها هەوڵی برایەتی کوردو فەلەکانی داوە، سورمە خانی خێزانی داود ئەفەندی ـ داودیش ئەو تاکە سوارەیە، کە لە نێو (٦٧) سوارەکەی مار شەمعوّن لە دەست سمکۆی شکاك دەرباز بوو ـ بە هاندانی داگیرکەران هەوڵی کوشتنی سەید تەهای داوە لە شاری بەغدا.

●

# عبدالله جەوهەرو[1]

# ڕۆژگاریکی

# ئەدەبی کوردی

سێ ساڵ لەمەو پێش عبدالله جەوهەری ئەدیبو ڕەخنەگر کۆچی دوایی کرد لە کۆچ کردنو یادکردنەوە شەیدا ئێمە بێدەنگ بوین کە دەبوا وەها نەبوایە چونکە کاری ئەدەبیو تێکۆشانی بەردەوامی ئەم مرۆڤە لە ڕادەیەکدایە کە هەموو ساڵ بابەتی نوێی لەبارەوە بنوسرێو دواجاریش تێکڕای بەرهەمەکانی کۆ بکرێتەوەو لە چاپ، بدرێت.

ئومێدئاشنا

بۆ ئەوەی ئەم نووسینەی ئێمە بتوانێت پەنجەرەیەك لە ڕوی ئەم مەسەلەیەدا بکاتەوە بەرهەمەکانی لە بڵاو کراوەو دەست نووس بەم جۆرەی خـــوارەوە دابەش دەکەین:ـ

**١ - پەخشانی هونەری**
**٢ - چیرۆك**
**٣ - شیعر**
**٤ - ڕەخنەو ڕەخنەی زمان**
**٥ - گۆڕین لە عەرەبیو ئینگلیزیەوە**
**٦ - پەندو ئامۆژگاری**

ئەم نووسینانەشی بەم ناوانەوە بلاو دەکردەوە. (ع. چالاك)، (ع)، (ج)، (ع. جەوهەر)، (ع ج)، بەتایبەتی لە گۆڤاری گەلاوێژو ڕۆژنامەی ژیندا، ئەمەش لەو ڕووەوە ئەم نوسەرە کەمتر حەزی لە خۆ دەرخستنو خۆ بردنە پێشەوەو ناوبانگ دەکرد.

لە نووسینو لە کردەوەشدا وەك هەموو جار دەمان بینی سادەو ساکار بوو هەتا خەڵکی باسیان نەکردایە ئەو باسی خۆیو نووسینەکانی نە دەکرد. یەکەم بەرهەمی بلاوکراوەی وەك من ئاگاداری بم لە ساڵی (١٩٣٩) دا لە ڕۆژنامەی - ژین - دا بوو بە ناوی - گلەیی -[٢] یەوە، کە لە زمانی ئینگلیزیەوە وەری گێڕابوە سەر کوردی. بەلام پێش ئەمە ساڵی ١٩٣٧ بەهۆی هان دانو دەست گیرۆیی - پیرەمێرد -ی نەمرەوە کۆمەڵێ بەرهەمی خۆی کۆ کردەوەو لە چاپخانەکەی پیرەمێرددا بە ناوی - ئاوات - ەوە چاپ کرا بەلام بەداخەوە کاربەدەستانی ئەو سەردەمە دەستیان بەسەرا گرتو نەیان هێشت بلاوبێتەوە. بەڕاستی پیرەمێرد وەك پیشەی هەمیشەیی خۆی بۆ هەموو شاعیرو نووسەرێك باوکێکی دڵسۆزو مامۆستایەکی ڕابەربوو، بەتایبەت لەو کاتەشدا بۆ لاوێکی حەڤدە ساڵی وەك - عبدالله جەوهەر - لە لایەکی کەوە مایەی دڵ خۆشی یە کە نووسەرێکی لاو سەرەتای بەرهەمی بلاوکراوەی لەو سەردەمەدا پەیوەندی دار بێت بەزمانو ئەدەبێکی بالای جیهانیەوە کە زمانو ئەدەبی ئینگلیزیە. کەمێك وەستان لەسەر ئەم نوبەرەیەی نووسەر شتێکی پێویستە. لە مانگی مارتی ساڵی ١٩٣٩ - دا لە - ژین - دا دەنووسێت «ڕۆژێکی بەهار بەسەر فەرشی تویی تەبیعەتدا بەناو گوڵاڵەو لالە زاردا سەر لە بەیانی ملی ڕێگام گرت بۆ دەشت بۆ گەشت، ڕۆیشتم تا گەیشتمە سەر یالێك لەوێ هەلۆیەکم دی مەلێکی لە ژێر چنگا بوو خەریکی لەتو کوت کردنی بوو، زۆری پێ نەچوو پۆلێك مەلی تر هاتنو لەوێ نیشتنەوە بەلام بەهیچ تەرحێك تەماشایەکی ئەو پەلەوەرە بێ نازەیان نەکرد. لە ڕێ گوزارما ئاغایەکم دی تێلایەکی لە نۆکەرێکی ڕوتو قوتی هەل گرتبو، خەریکی بیدار

کردنی بوو، ئەوەندەی لێ دابوو خوێن وەك فیچقە لەشیەوە بازرەقەی ئەبەست هێشتا نەگەیشتبومە بەرەوە نوکەرەکە لە پەل و پوکەوت و لە ژێر پێی ئەو زۆردارەدا ڕاکشا، بە هەزاران ئەهاتن و ئەچون کەسێکیان دڵیان بەو داماوە قوڕ بەسەرە نە دەسووتا کە لە ژێر دەستی ئەو بەدبەختە دەری بێنن. ئایا بۆچی هەموو ڕۆح لە بەرێك هەریەك بە تەنگ هاو خوێنیەوە نایەن و لە ڕۆژی تەنگانەدا فریای ناکەوێ و خۆ خۆریان هەرگیز لە ناو نابرێت، لەدوای ئەمە لە بارەگای یەزدان پاڕامەوە یا مەرگ یان بەجارێ چاو بێ نەکەوتنی چنکی خویناوی زۆر دارو نەبیستنی ناڵەی داماوان و گریەی هەژاران. بەلام یەزدان دوعایەکەمی هێنایە جێ ئیتر منیش گوێم لە هەموو ترش و تاڵی و بێ پەیمانیەکی زەمان لینج بووە[٣].

ئەم پارچە ئەدەبیەی کە نووسەر هەڵی بژاردوە لە دوو لایەنەوە تەماشا دەکرێ یەکەم لایەنی ئوسلوب واتە شێوەی نووسین و دەربڕین، کە ئەمیش لەو کاتەدا وەك زۆر لە شاعیرو نووسەرەکانی سالانی سی و سەرەتای چلەکان لە ژێرکاری گەریەکی ڕۆمانتیکیانە دابوە، نەك هەر ئەمە بەڵکو ئەو پارچە پەخشان و وتارو چیرۆکانەش کە نووسیونی لە ڕوی شێوەوە پەیڕەوی قوتابخانەی ڕۆمانتیکی کردوە. لە لایەنی بابەتیشەوە نووسەر لەهیچ بەرهەمێکیدا دوای خەیاڵ و ئەفسانەو بیرو باوەڕی کۆن و پڕو پوچ نەکەوتوە. بەڵکە بابەتەکانی لە واقیع و ڕاستەقینەی ژیانی کۆمەڵەکەیەوە هەڵ هێنجاوە. نەخۆشیە کۆمەلایەتیەکانی خستۆتە ڕوو وەهەوڵی داوە چارەسەریان بۆ بدۆزێتەوە. ڕون تربلێین لەبارەی ناوەڕۆکەوە نووسەرێکی ڕیالیزمی بووە. بەلام لە ڕوی چارە سەرکردنەوە وەك لە نووسینەکانیدا دەر دەکەوێت وەك بیر کردنەوەی ئەو سەردەمەو کەمتر کامل بون و پێ گەیشتنی بیری شۆڕش گێری بڕوای بە چارەسەری ـ اصلاح ـی هەبووە بڕوانە نووسینەکانی:ـ

| | |
|---|---|
| ـ نیشتمان پەروەر | ١٩٣٩ |
| ـ ئاغا گیان | ١٩٤٨ |
| ـ ناڵەی هەژارێك | ١٩٤٢ |
| ـ هاوار ژنینە | ١٩٤٣ |
| ـ من و یارم | ١٩٤٢ |
| ـ چوار هەژار | ١٩٤٥ |
| ـ لە خەوما | ١٩٤٤ |

له ناو ئەمانەدا لە هەموان زیاتر ساڵی ١٩٤٨ لە گۆڤاری گەلاوێژدا پەخشانی - ئاغا گیان - دەنووسێت کە دیارە ڕاپەڕین و بارو دۆخی ئەو سەردەمەی عیراق بەگشتی و کوردستان بەتایبەتی، وە پێگەیشتنی بیرو باوەڕی شۆڕشگێڕی، ڕاوەستان دژی دارو دەستەی زۆرداری پاشایەتی کاری کردۆتە سەر قەڵەمی عبدالله جەوهەر لەم نووسینەدا بەرەو دەربڕینێکی ئاشکراترو هەنگاو نانێکی نوێ دەڕوا بەڵام بەداخەوە نەیتوانیوە بگاتە ئەنجام و تەنها باری ژیانی تاڵ و گوزەرانی دەردەسەری جوتیارێکی دەربڕیوەو هێمایەکی ئەو تۆی تێدا نیە کە بەرانبەر زۆرداری ئاغا هێزو بزوتنەوەیەك لە ئارادا بێت و مژدەی نزیك بونەوەی مەرگی هەموو ئاغاکان بدات، ع. چالاك - دەنووسێت «ئاغا گیان، پێڵوی چاوم بە پێکەنین هەڵدراوەتەوە، تۆ بە چ ئاینێ ئەم گرێنی ؟!. گۆش کراوی سەربەستیم، لەبەرچی هەموو بەرگێکی پیاوەتیت لەبەر داماڵیوم، وەها بانگ دراوە بەگوێما پێ بە پێی هەموو کەسێ بم، ئنجا بە چە دەستورێ دڵ نەوازی تۆ بکەم ؟! لە قوڕشێلی هەموو ئاواتێکم زیاتر بۆ چی ناهێڵی پەنجە لەپەنجەی ئینسانێك بدەم، ئینسان نیم ؟! یا بە ئینسانم نازانی ؟!. بە ئومێدی چاو بڕینە بەختیاری، بەرەو ڕوشنایی ژیان ختوکەو دڵخۆشی دراومەتەوە تۆ بە چە باوەڕێ پێوەنگی دیلیت لە ئەستۆم گرێ داوەو سەراسیەو حەپەساو بە گوێ دەریای مەینەتا ئەوگێری. بۆچی من بچەوسێمەوەو ئاسودەیی و خۆش بەختیش بە باڵای تۆ بڕا بێ ؟ بۆ چ من دیل بم و تۆ ئازادو سەر فراز»[٤] بەلای منەوە ئەگەر لە کاتی خۆیدا واتە ساڵی (١٩٣٧) کتێبی - ئاوات - ی - ع. چالاك - بڵاو بوایەتەوە ئەوا کاری‌گەریەکی زۆری دەبوو لە دوولایەنەوە یەکەم، دەکەوتە دەستی خوێندەواران بەگشتی و لە کتێبخانەکاندا هەموو کات جێگای خۆی دەگرت.

دووەم، ئەو نووسەرانەی لەو کاتەوە سەبارەت بە پەخشانی هونەری و چیرۆکی کوردی نووسیویانە زیاتر ئاوڕیان لە بەرهەمەکانی ئەم ئەدیبە دەدایەوەو بە ئامادەیی وەك سەرچاوەیەك لە بەردەستیاندا دەبوو. وە ئەگەریش جاروبار ئاوڕی لێ درابێتەوە ئەوا دیارە ئەو نووسەرە گەلێ ماندوو بوەو لەم گۆڤارو لەو ڕۆژنامە هەتا بەرهەمێکی دۆزیوەتەوە. هەتا ئێستا کە باسی نووسینەکانی - عبدالله جەوهەر - کرابێت ڕاستەو ڕاست باسی گۆڤاری گەلاوێژ کراوە چونکە زۆربەی بەرهەمەکانی لەوێدا بڵاو کردۆتەوە. لە پاش داخستنی ئەم گۆڤارە لە ساڵی (١٩٤٩)دا ئیتر ئەویش لە بڵاوکردنەوە وەستاو نووسینیشی کەمتر بوەوەو ئەو گەرمی و گوڕیەی جارانی بڵێسەی کەم بوەوە. ئنجا

سەرەتاکە باسی بەرهەمی. ع. چالاك ـ مان کرد لە ـ ژین ـ دا باسی ئەوەمان کرد کە چۆن (پیرە مێرد) ی ئەمر یارمەتی داوە زۆر جاریش لە ڕووی زمانو داڕشتنەوە هەندێ دەستکاری لە نووسینەکانیدا کردوەو بۆی بڵاو کردوتەوە. لەو نووسینە سەرەتاییانەی پەخشانێکە بە ناوی ـ نیشتمان پەروەر ـ کە سالی ـ ١٩٣٩ ـ بڵاوی کردوتەوە. ئەم پەخشانە گرنگیەکی تایبەتی هەیەو بۆکەسێك لەو تەمەنەدا وەها بنووسێت شایانی سەرنجو ئافەرینە. لەو نووسینەدا ع. چالاك دوو خالی زۆرگرنگ سەبارەت بە مەسەلەی ڕامیاریو نیشتمان پەروەری دەست نیشان کردوە. یەکەمیان، ئایا نیشتمان پەروەری ڕاست کێیە ؟ دوەم، ئایا کام، ڕێگای تێکۆشان دەتوانێ گەل بگەیەنێتە ئامانجەکانی ؟ لەم بارەیەوە دەنووسێت (ئێمە کە ڕۆڵەی ئەم ناوەین لامان وایە هەر چی ڕیشیبێ سوور هەمزاغایە. هەرچی هاتو زمانی لوسی لێ خستینە کار ئەگەر دوژمنیشمان بێت بێ تاقی کردنەوەی ئەچینە سەر بیریو ئەبینە گورزی دەستی، نیشتمان پەروەر ئەو دلاوەریە بە مالو بە گیان تەقەلا بداو درێغی نەکات لە ڕێی دەرهێنانی گەلیا لە ژێر پەنجەی بێگانە. لەم قەرنی بیستەمەدا بە قسەی خۆشو بە خەندە تێ نەکەوینەوە، ئیشمان نەدەینە دەست نەزان کاران»[٥] هەر وەها ـ نالەی هەژارێك ـ[٦] چیرۆکێکی ساکارە بەلام بۆ ڕۆژگاری خۆی نرخی تایبەتی هەبوو. باسی هەرەوەزیو یارمەتی دان دەکات لەکۆمەلدا کە نمونەی ڕەوشتی بەرزو بیری مرۆڤانەیە. بەو جۆرەی کۆمەلێك مەل کە گیان دارن یەکێکیان لەناو باخێکدا تووشی کارەساتێك دەبێو ناتوانێ ڕزگاری ببێت. بەلام هاوڕێکانی دەگەڕێنەوە سەریو بە جێی ناهێلن هەتا بە هەموو ڕزگاری دەکەن، بەلام ئەم مرۆڤێك دەبینێ کە ئافرەتێکی بێ دەرەتانەو دەسوڕێتەوەو کەس لای لێ ناکاتەوەو یارمەتی نادات، وە بەراورد دەکات کە ئەو بالندانە بەو جۆرە گیانی یارمەتی دانو لە خۆ بوردنیان تێدا بوو بەلام ئێمەی مرۆڤ نەمان توانی ئەو ئافرەتە ڕزگار بکەینو تەنانەت وەك ئەو بالندانە ڕەفتار بکەین. لە پەخشانی ـ منو یارم ـ[٧] دا بە شێوەیەکی ڕۆمانتیکی لەگەل خۆشەویستەکەیدا دێتە گفتو گۆو بەلام وەك ئوسلوبی باوی ئەو سەردەمە لە کۆتاییدا دەیباتەوە بۆ سەر سەربەستی ئافرەتو باری دواکەوتوی کۆمەل لە سەرەتادا دەنووسێت:

«ـ کێ ئەتوانێ بلێسەی ئاگری ئەم دوو دلە بکوژێنێتەوە ؟ کێ ئەتوانێ ئەم دوو گولە لەیەك بکاتو هەلیان وەرێنێ ؟ کێ ئەوێرێ خۆی لە قەرەی پساندنی تەلی دوو دلی بەیەکەوە نووساوو بەهێز وەك منو تۆ بدات ؟ کێ دلی دێت

ڕۆشنایی ئەم دوو چرایە لە ناوا نەهێڵێ ؟ کەس.»[8] ئەگەر بەوردی تەماشای بەرهەمی ئەم نووسەرەو زۆر لە نووسەرانی تریش بکەین کە لەو سەردەمەدا نووسیویانە بەئاشکرا ئەو هێڵە ڕۆمانتیکیو ئوسلوبە باوە دیارە کە لەو ژگارەدا لە ناو نووسەراندا پەرەی سەندبوو وە بە شێوەیەکی نوێ لە ئەدەبی کوردیدا دەناسرا. ئەمەش لە دوو لایەنەوە بوو، لایەنی یەکەم کە زیاتر نزیكو کاری گەر بوو ئەو شەپۆلە بوو کە لە ئەدیبەکانی ـ مەهجەر ـ ی عەرەبییەوە بە هۆی کۆمەڵی ـ الرابطة القلمية ـ[9] وە دەهات بۆ ڕۆژهەلات کە زیاتر بریتی بون لە نووسینەکانی ـ جبران خليل جبران ـ و ـ ميخائيل نعيمە ـ و زۆریان وەردەگێڕانە سەر کوردی. لەوانەی بەرهەمی ئەو نووسەرانەیان کردوتە کوردی لەو سەردەمەداو لە ژێرکاری گەری ئەواندا بوون ئەمانەن: ـ

- ـ پیرە مێرد لە پەخشانی مناجاة أرواح ـ ی جبران خليل جبران ـ دا.
- ـ گۆران لە شیعری (دوێنێ) بالأمس ـ ی جبران دا
- ـ میرزا مارف لە ـ محبت ـ و ـ جمال الموت ـ دا
- ـ عبدالقادر قەزاز لەگەلاوێژو ژیندا.
- ـ ئەحمەد هەردیو شاکر فتاحو سجادیو بلەو ڕەشید نەجیبو دلشادی ڕەسولو ئیبراهیمی نادری لە گەلاوێژو (دەنگی گێتی تازە ـ دا وە چەند نووسەری تریش. لە ناو ئەمانیشدا عبدالله جەوهەر پەخشانی ـ ژنی ئازاد ـ ی لە ژێر ئەم کاریگەریەدا وەرگێڕاوە.

ڕۆشنبیرانی ئەو سەردەمە هەتا سالانی پەنجا لە ژێر ئەم کاری گەریەدا مابونەوەو ئوسلوبی ڕۆمانتیکیو ناوەڕۆکی ڕیالیزمانەیان ڕەچاو دەکرد. بەلام وردە وردە بەهۆی بەرزبونەوەی هۆشی ڕامیاریو بزوتنەوەی نیشتمانیەوە ناوەڕۆك بەرەو ڕیالیزمی شۆڕشگێڕانە ڕۆیشتو دیارە کە ئوسلوبی دەربڕینو داڕشتنیش وەك خۆی نەمایەوە. ئنجا لە ڕوی شیعریشەوە با ئاوڕ لە ـ عبدالله جەوهەر ـ بدەینەوە و بزانین لەو چەند پارچە شیعرەدا چی بۆ کردوین ـ ع. چالاك ـ لای هەموان بەهەر شێوەیەك ناسرابێت وەك شاعیر نەناسراوە. لە ڕاستیشدا هەر وایەو خۆشی ڕای وەها بوو.

بەلام لە سەرەتادا چەند پارچە شیعری لە سالی (١٩٤٢)دا لە ڕۆژنامەی ـ ژین ـ دا بلاو کردوتەوە. بەم ناونیشانانە، (لە دوور ولاتێکەوە، هاوزمان، کەلەبابو باز،) من چەندە گەڕام لەم سێ شیعرە زیاترم نەدیەوە. دیارە خۆیش

هەر زوو وازی لە شیعر هێنابێ‌و نەچو بێتەوە بەلایدا. ئەمەش لە بەر دوو هۆ، یەکەم، خۆی هەستی کردوە کە بەمانای تەواو ناتوانێ شاعیر بێت، دوەمیش، هەستی کردوە کە مەودای دەربڕین‌و توانای لە نووسیندا زیاترەو لەو بوارەدا دەتوانێت زیاتر مەبەستەکانی خۆی بگەیەنێت.

وەك لەم شیعرەیدا دەبینین کە شاعیریەتی ئەو لە ڕادەی نووسین‌و داهێنان‌و گۆڕینەکانیدا نەبوون‌و لاوازن. باشتریش کە زوو خۆی هەستی کردو دەست بەرداری بوو. ئەمە پارچە شیعری ـ کەڵەباب‌و باز ـ[10] و دوایشدا سەرنجی خۆمانی سەبارەت دەنووسین:

«لە خانەی گەورە ماڵا
دوو مەلی ئاڵ‌و واڵا
یەکێکیان بازی نازدار
کە لەشێری پۆپنەدار
بە جوتە بەلەنجەو لار
ئەگەڕان وەك دۆست‌و یار
ئەیان ڕشت خەفەت بەدل
لە سەر ئەم چڵ بۆ ئەو چڵ
پێکەوە بە دل خۆشی
بادەی کەیفیان ئەنۆشی
ڕۆژێ بازوا بەچستی
پڕ لە هاوڕێ‌و دۆستی
تۆ بۆچ وا بێ پەیمانی
ناکەس‌و بێ ئیمانی
دانی تۆ هەموو ڕۆژێ
گەنمە پڕ بە کۆشێ
بۆت ساز دراوە لە قوڕ
کولانەی زۆر گەرم‌و گوڕ
بۆت ئەباری خێرو بێر
ئازادو دلشادو تێر

کە دێتە سەر سەر بڕین
ئەکەویتە هەڵ فڕین
من کە مە لێکم کێوی
جسمم لە جێی نەدیوی
هەرچەندە دوور هەلدڕێم
هەرگیز لێیان ناتەرێم
کەلەباب وتی وامە
کوێرایی بێ بەچاومە
زۆرم دی بەچاوی خۆم
دران لە زەوی چەوت‌و کۆم
بە پشکۆی ـ سووری ئانی
ئەکران بە بریانی
لام وایە گەر تۆ جارێ
بت دیایە ئازارێ
یا بازێکیان بێنایە
لای تۆ سەریان بڕیایە
لەمن زیاتر بە پەرۆش
دەکەویتە سەملو جۆش
لە ترسی دەستی زۆردار
ئەتەرای لەم شارەو شار»[11]

لەم شیعرەدا ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ کە بابەتەکــە چیرۆکــە بەشیعــر گێڕاوەتەوە. شێوەی داڕشتن‌و وشەکان جۆرە لاوازیەکیان تێدا دەبینرێ وەك ئەوەی کەڵەباب بتوانێ وەك باز لەم چڵ بۆ ئەو چڵ بفڕێ. بەڵام لە ناوەوەڕۆك‌و مەبەستی شاعیردا دە یتوانی ئەم ناوەڕۆکە وەك زۆر نووسین‌و پەخشانەکانی تری بکاتە پارچە پەخشانێکی ئەدەبی‌و زیاتر مەودای دەبوو بەسەربەستی لە مەبەستەکان بدوێت.

لە کۆتاییدا دەڵێین عبدالله جەوهەری نووسەرو ڕەخنەگر لە سەردەمێکی دژوارو سەختدا قــەڵەم بەدەستێکی نــەترس‌و خــاوەن داهێنانێکی ئــەدەبی‌و پەخشان نووسێکی دیار بوو. هەزار ڕێزو ئافەرینیش بۆ گۆڤاری گــەلاوێژ ـ ی هەمیشە گەش‌و نەمر کە زۆر نووسەری وەك عبدالله جەوهــەر ـ ی پێشکەش کردین‌وماڵی ئەدەبی کوردیمانی ئاوەدان کرد.

---

سەرچاوەکان:ـ

---


١ ـ عبدالله جەوهەر (ع. چالاك) لە ساڵی ١٩٢٠ لە دێی مێوڵێ ناوچەی قەرەداغ لە دایك بوەو سەرەتای خوێندنی هەتا زانکۆی بەغدا لە سلێمانی بوە. وە لە ڕێکەوتی (١ ـ ٦ ـ ١٩٨٢) دا لە سلێمــانی کۆچی دوایی کــرد تــائێستــا تــەنهــا کــاك ـ ئــازاد عبدالواحد ـ وتارێکی لە ڕۆژنامەی العراق ـ دا. لە سەر نووسیوە.
٢ ـ کلەیی ـ ژین ژمارە (٥٥٨) ساڵی ١٩٣٩.
٣ ـ هەمان سەرچاوە
٤ ـ پەخشانی ـ ئاغاکیان ـ گەلاوێژ ساڵی ١٩٤٨ ژمارە (٣) ساڵی (٩).
٥ ـ ژین ژمارە (٥٧٢) ساڵی ١٩٣٩
٦ ـ گەلاوێژ ژمارە (١٠،٩) ساڵی ١٩٤٢
٧ ـ گەلاوێژ ژمارە (١٢،١١) ساڵی ١٩٤٢
٨ ـ هەمان ژمارە
٩ ـ بروانە کتێبی ـ جبران خلیل جبران ـ تالیف ـ میخائیل نعیمە ـ
١٠ ـ ژین ژمارە (٦٧٦) ساڵی ١٩٤٢.
١١ ـ هەمان سەرچاوە.

نەتەوەی بەلاڤکرینەو هەتا پلەیەکێ هەست ب نویکاریێ ل بەرهەمێد وی تێتە کرن.[3] ئەڤ هونو هوزانا «ژ بو **شریف پاشای**» را پێشکێش کری.[4]

دیسا ژ شەجاعەتا تە ئەی خان
دەریەك ڤەبو ژ بومە کوردان
ئیدێ بەسە ئەڤ جەڤاو زیللەت
بێ عیلمو فەزل بمینە مللەت
ئەڤ عەسرە بلندیێ دخوازت
هەتا وەکو ژین چ یە، بناست
فەخرێ دکن ئەم بتە، تو کوردی
ئەلهەق کو تو مێری، هەم تو مەردیپشتا تەیە جوملە کورد،کورمانج
لە ورا کو د وێ رییێ دا فیدانە.

☆ ☆ ☆

هوزانڤانو نڤیسەر ع. رەحیمی هەکاری ژی ل سەر شولا ئێکەتیێو هەڤگرتنێ مشە نڤیسینو هوزان ڤەهاندینە وەك:

«دەستێ تەنێ دەنگ ژێ نایێت»[5]
ئەمی مللەتێ ساحب نیفاق
لازم ژ بو تە ئیتفاق
تأسیس نەکین ئەم یەك ویفاق
مەحویەتە بیل - ئیتفاق
عەقلێ خوە بەر هەڤ کن هەمی

☆ ☆ ☆

وەخت، زەمان پڕ نازکە
بێ ئیتفاقێ تەهلوکە
خەلقان هەمی دگەل مە ڕکە
مەحویەتا مە بیشکە
عەقلێ خوە بەر هەڤ کن هەمی

☆ ☆ ☆

# چالاکی یەکانی

# یەکێتی ئەدیبان و نووسەرانی کورد

# - لقی سلێمانی

## • کردنەوەی لقی یەکێتی ئەدیبان و نووسەرانی کورد لقی سلێمانی

ئامادە کردنی: ژیوار

لە یەکێك لە ڕۆژە سپی یەکانی شاری هەڵەت و قوربانی.. ڕۆژی ۱۹۸۵/۲/۲۸ لە ڕۆژێکی بەفر باریودا ئەدیبان و ڕوناکبیرانی ئەو شارە، بەکەف و کوڵ و دڵێکی پڕ لە میهرو خۆشەویستی بۆ وشەی کوردی لە هۆڵی کتێبخانەی گشتی کۆبوونەوە بۆ ئەوەی لەگەڵ لێپرسراوان دەربارەی گیروگرفتەکانی ڕۆشنبیری و مەسەلەی کردنەوەی لقی یەکێتی بدوێن و مەسەلەکە لە - ڕاوەڕێوی - دەربکەن و دلسۆزانە ڕوو بە ڕووی ئەو مەسەلەیە ببنەوە.. لە پاش ئەوەی کاك ئازاد عبدالواحد وتاری ئەدیبانی خوێندەوە لیپرسراوان بەڵێنی جێ بەجێ کردنی داوا کارییەکانیاندا.

پاشان مەسەلەی هەڵبژاردن و کردنەوەی لقەکە خرایە دەنگ دانەوە، زوربەی ئامادە بوەکان ئەوەیان بە چاك زانی چیتر ئەو مەسەلەیە وا بە لنگەو قوچی نەمێنێتەوە بۆیە ڕایان لەسەر ئەوە یەکی گرتەوە کە - هەڵبژاردن - بکری و لقەکە بکرێتەوە، تاکو بکەوێتەوە چالاکی خۆی ئنجا (۹) کەس خۆیان بۆ دەستەی بەڕێوەبردن هەڵبژارد لەوانە (۵) کەسیان دەرچوون: محەمەد ئەمین پێنجوێنی

(٣٠) دەنگ ئازاد عبدالواحد (٣٠) دەنگ عثمان شەیدا (٢٩) دەنگ ئومێد ئاشنا (٢١) دەنگ کەریم زەند (١٩) دەنگ، ئەو برایانەش لەناو خۆیان کارو باریان بەم جۆرە دابەش کرد:

| | |
|---|---|
| ١ ـ محەمەد ئەمین پێنجوێنی | سەرۆك |
| ٢ ـ ئازاد عبدالواحد | سکرتێری ئیداری و رۆشنبیری |
| ٣ ـ عثمان شەیدا | ژمێریار |
| ٤ ـ ئومێد ئاشنا | ئەندام |
| ٥ ـ کەریم زەند | ئەندام |

هەروەها برایان (ساجید ئاوارە) و (صلاح محمد) بە ئەندامی ئیحتیات دەرچوون. دوای دامەزراندنی لقی یەکێتی، دەستکرا بە چالاکی نواندن یەکەم چالاکی یەکێتی کۆڕێکی شیعر خوێندەوە بوو کە بە بۆنەی ـ جەژنی نەتەوایەتیمان ـ جەژنی نەورۆزەوە ساز کرا..

● یەکەم کۆڕی وەرزی رۆشنبیری یەکێتی ناو ـ کۆڕێکی فراوانی شیعر خوێندنەوە بوو بەبۆنەی جەژنی نەتەوایەتیمان ـ جەژنی نەورۆز ـ ئەو کۆڕە سەرلە ئێوارەی رۆژی (٢٣)ی نەورۆزی ساڵی ١٩٨٥ لە هۆڵی نەقابەی کرێکاران شاری سلێمانی رێك خرا.. خەڵکێکی زۆر لە شیعر دۆستان و رۆشنبیرانی شارەکە ئامادەی ئەو کۆڕە ببوون.. سەرەتا کاك ئازاد عبدالواحد سکرتێری رۆشنبیری بە خێر هاتنی ئامادە بوانی کردو کۆڕەکەی بەڕێوەبرد. ئنجا سەرۆکی لقی سلێمانی کاك (محەمەد ئەمین پێنجوێنی) وتارێکی خوێندەوە کە لە وتارەکەیدا باسی بزووتنەوەی شیعرییەی کرد کە لە پاش هەڵبژاردنی لقی یەکێتی هاتە بەرهەم لە پاش بێدەنگ بوونێکی درێژ خایەنی یەکێتی نووسەرانی ئەو شارە، ئنجا هاتە سەر بارو دۆخی یەکێتی و شێوەی دروست بوونەوەی لقەکەو ئاواتەکانی، داهاتووی کە نیازی بەجێ هێنانیان هەیە لەگەڵ دەرکردنی گۆڤارێ بەنێوی (پیرە مەگروون) و چەندەها یادو کۆڕی تر کە ئیش کردن سەنگی مەحەکی هەموو کارو کردارێکە و ئەندامانی دەستەی بەڕێوەبەریش هەرلەو پێناوەدا هاتونەتە کۆڕی ئیش کردن.. هەروەها ئەوەشی دوپات کردەوە کە یەکێتی موڵکی هەموو نووسەرێکی کوردە کە بیەوێ خزمەت بکاو موڵکی هەموو نووسەرێکی ئازادیخوازە و دەستەی بەڕێوە

بردنی تازەش درێـژە بە خـەباتی لەوەو پێشینـەی یەکێتی دەدات و بـەموو لە ئامانجەکانی لانادات. و داخستنی یەکێتیشی هیچ سودێکی نی یە ئەگەر زیانی زۆر نەبێ.. ئنجا بەڕێوەبەری کۆڕ کەوتە پێشکەش کردنی شاعیرەکان کە لە هەولێرو کۆیەو دهۆك و سلێمانی بوون لەو شاعیرانە: [س. ع. شادمان، هزرڤان، حەمە عەلی وریا، محەمەد ئەمین، پێنجوێنی، فوزي محمد، شێرکۆ عبدالله، ساجد ئاوارە، سامیە محمد، ئیبراهیم محەمەد ئیبراهیم، لەتیف قەرەداغی، محمد عمر عثمان، شەهاب عثمان، دلاوەر قەرەداغی، هشیار محمد حسن، ئاوات کامیل، تۆفیق نەبەز. لە کۆتاییدا مـامۆستـا (دیلان) پـارچە شیعـرێکی تازەی خـۆی پێشکەش بە ئامادە بوان کردو سەرۆکی لق بە چەپکێ نێرگز ڕێزی لە شاعیری گەورەمان مامۆستا (دیلان) ناو کۆتایی بە کۆڕە هات.

● هەروەها لە ٢٢/ی نیسانی ئەمساڵدا یەکێتی نووسەران و ئەدیبان کەوتە خۆی بۆ یاد کردنە وەی جەژنی ڕۆژنامەنووسیی کوردی ـ لە سـەرەتاوە کـاك دڵشاد مەریوانی کۆڕەکەی دەست پێکردو ئنجا کاك (ئازاد عبدالواحد) وتاری دەستەی یەڕێوەبەری بەو بۆنەیەوە خـوێندەوەو تیـایدا بـاسی گرنگی دەوری ڕۆژنامەی کرد لە ژیانی نەتەوەدا بۆ هوشیار کردنەوە ودروست کردنی گیـانی لێپرسینەوە تیایدا.. هەر وەها باسی هۆیەکانی سەرهەڵدانی ڕۆژنامەی کوردی کرد کە بارودۆخی سیاسی کورد پێویستی دەرکردنی ڕۆژنامەی سەپاندووە دوا بەدوای ئەو کـاك مومتـاز حەیـدەری وەك ڕۆژنامـە نووسێـك لەو یادە پیـرۆزە بەشداری کرد کە لە هەولێرەوە بۆ ئەو مەبەستە هاتبوو، باسێکی گرنگ و تێرو تەسەلی لە سەر ڕۆژنامەی ئومێدی ئیستقلال پێشکـەش کرد بـە ناوونیشـانی (گیانی کوردایەتی لە ڕۆژنامەی ئومێدی ئیستقلال) دالە سەرەتاوە کاك مومتاز بەرێك وپێکی باسی شاری سلێمانی کرد وەکو مەڵبەندێکی ڕۆشنبیری و سیاسی کە بۆتە هۆی لەدایك بـوونی دەیەهـا کەڵە ئـەدیب و ڕوناکبیـرو ئنجا هـۆیەکـانی سەرهەڵدانی ئەو شارەو بەراورد کردنی بە شاری تـری کوردستـان و دەست پێکردنی بزوتنەوەکانی شێخ مەحمودی نەمری بەدرێژی ڕوون کردەوە، کە ئەم ڕۆژنامەیە بەرهەمی خەباتی ئەو بارو زروفەیە کە کورد تیایا کەوتـە جوڵان بـۆ مافی خۆی.

دوا بە دوای ئەو کورتە باسە هاتە سەر باس کردنی ڕۆژنامە کەکەزمانی حاڵی شێخ مـەحمودی نـەمر بـووەو هەنـدێ لاپەڕەی گـرنگی لەو ڕۆژنامـەیە..

خوێندەوەو خۆی دەکەوتە روون کردنەوەو راڤە کردنی ئەو لاپەرانە، کەتاکو ئە-
-مڕۆکەش ئەو کێشانە هەربنەبڕ نەکراون وچارەسەرێکی بنەڕەتیان بۆ
دانەنراوە.. باسەکە لەگەڵ ئەوەشدا کە دوورو درێژ بوو، بەلام لەبەر ئەوەی
باسێکی تازەبوو خەڵکە کە بە پەرۆشەوەگوێیان بۆشل کردبوو... لێکۆڵینەوەی
دوەم لەو کۆڕەدا کورتە باسێکی برای رۆژنامە نووس کاك (ئازاد مەحمودی
مستەفا) بوو کە زیاتر باسەکەی لایەنی هونەری رۆژنامە نووسیی گرتبوەوە لە
سەرەتادا بە کورتی باسی چاپخانەکانی کوردستانی کرد لە گەڵ مێژووی
سەرهەڵدانو کار کردنیان.. دوایی هاتە سەر باسی لایەنی هونەری ئێستای
رۆژنامە نوسیی کورد و ئەو قۆناغەی پیایا رەت ئەبێت لە بەکار هێنانی ئامێری
ئەلکترۆنی ئۆفسێت.. ئەو ئامێرە نوێیانەی کەبواری داهێنانی بۆ دانەربەجێ
هێشتوە.. پاشان ئەو کەمو کورتیانەی باس کرد کە لە چاپەمەنییە کوردییەکان
ئالاوە. لەگەڵ رێبازەکانی رۆژنامەنووسیی.. ئەو خاڵانەی کە کار دەکەنە سەر
پێش نەکەوتنی رۆژنامە نووسیی کوردی باسکرد کە لەوانە نەبوونی
چاپخانەیەکی سەربەخۆیە بۆ لە چاپدانی گۆڤارو رۆژنامە کوردییەکان.. هەروەها
نەمانەوەی کادیرە هونەرییەکان لە شوێنی خۆیانو بایەخ نەدان بە دەزگا سەرپە-
-رشتکارەکان بۆهێنانە دی کادیری هونەری کورد کەبتوانێ لە بواری رۆژنامە
نووسیدا ئیش بکات..
سێیەم باس، باسەکەی کاك (ئومێد ئاشنا) بوو کە
بەناوی -جێگای پیرەمێرد لە رۆژنامە نووسیی کوردیدا -بوو. کاك ئومێد زیاتر لە
بارەی ژیانی رۆژنامەنووسیی پیرە مێرد دوا لە تورکیا ئەوەشی روون کردەوە کە
پیرە مێرد بە نازناوی (پیرەکورد)و (سلیمانیەلی توفیق) و (س-ت) هوە لە نۆ
گۆڤارو رۆژنامەی ئەو سەردەمەی تورکیادا بەرهەمی بلاو کردوتەوە. هەروەها
سەر نووسەرو خاوەن ئیمتیازی رۆژنامەی (کورد) بووە کە دەنگی کۆمەڵی تەعالیو
تەرەقی کورد بوو لە تورکیاو ئەو رۆژنامەیە لە ساڵی (١٩٠٨) هوە دەرچووەبە
زمانی تورکی و کوردی نووسینی بلاوکردوەتەوە.. پیرەمێرد دەورێکی بالای
هەبووەلە مێژووی رۆژنامە نووسینی کوردیداو هەر لە ساڵی (١٩٠٥) هوە کە لە
کۆلێجی حقوق کەپێیان وتوە - مکتب حقوق - هەتا گەرانەوەی لە ساڵی
(١٩٢٤)دا ئەم رۆژنامە نووسە قەڵەمی دانە ناوە. لە ساڵی (١٩٢٦)هوە لە
سلێمانی راستەوخۆ بەشداری کردووە لە رۆژنامەی (ژیان). کاك ئومێد لە بارەی
ژیانی پڕ لە تێکۆشانی رۆژنامە نووسیی پیرەمێرد لە تورکیا زیاتر زانیاری
نوێ روون کردنەوەی پێشکەش کرد. وەك ئەوەی کە پیرەمێرد ئەندام بووەلە

کۆمەڵی کورد لە تورکیا و رۆژنامەی ـ کورد ـ بەتایبەتی ئەرکی لە سەرشانی ئەو بوو. جگەلەوەش نووسەر بە بەڵگەوە ئەوەی روون کردەوە کە پیرەمێرد هاوڕێی ـ عبدالحق حامد ـ بووە. ئەم کۆڕە سێ سەعاتی خایاند.. جێگای رەزامەندی خەڵکی بوو.

● (تۆ بۆگرافیای دەروونی لای فروید) ئەم ناوو نیشانی ئەو کۆڕە بوو کە کاك دکتۆر شێرکۆ عەبدوڵلا لە ۱۹۸٥/٤/۲٥ دا لە باخچەی یەکێتی نووسەران سازی کرد، لە سەرەتاوە کاك دلشاد مەریوانی بەڕێوەبەری پێناسە یەکی کورتی فرویدی پێشکەش کردو ئنجا دکتۆر شێرکۆ هاتە سەر باسەکەی کەلەو باسەدا باسی جوگرافیای دەروونی مرۆڤی کردو لە سەرەتاوە تەعریفێکی مەسەلەی تۆبۆگرافیای کردو ئنجا بەدرێژی باسی (ئەو.. من.. منیبەرزی) کرد کە سێ بنەرەتی روون‌ئاشکران بۆ پێك هێنانی کەسایەتی مرۆڤ، ئنجا باسی خرۆشان‌و دلە راوکەو هیستریاو سادییەت‌و ماشۆسییەت‌و هەموو ئەو لایەنانەی کرد کە پەیوەندی بە باسەکەیەوە هەبوو.

● (عەبدوڵلا جەوهەرو رۆژگارێك لە ئەدەبی کوردی) ئەمەش ناونیشانی ئەو کۆڕە بوو کە لە لایەن کاك (ئومێد ئاشناوە) تەرخان کرابوو بۆ یادی مامۆستا عەبدوڵلا جەوهەر. لە سەرەتاوە بەڕێوەبەری کۆڕەکە کاك ئازاد عبدالواحد بۆئەم یادەو گرتنی ئەم کۆڕە کورتە وتارێکی خوێندەوەو باسی پایەی مامۆستای ناوبراوی کرد وئنجا کاك (محەمەد ئەمین پێنجوێنی) وتاری دەستەی بەڕێوەبردنی خوێندەوەو تیایدا باسی چالاکییەکانی ئەو چەند مانگەی یەکێتی کرد کە لەگەڵ هەموو تانەیەکی بەد خواهان بە ئەنجام گەیەنراوەو سوربوونی ئەندامانی روون کردەوە کە تانەی ئەو کەسانە لە گوێ‌تینمان کەم ناکاتەوە. بەردەوام دەبین لە سەر کۆڕ بەستن‌و خزمەت گوزاری.. بە بێ سارد بوونەوەو گوێ دانە هیچ شتێ.. بەتایبەتیش چە ماوەر کە ئەمرۆکە باش رەش وسپی لێك جیادەکاتەوە دەزانێ گوێ لەکوێ دەگرێ‌و لە کوێ ناگرێ.. ئنجا کاك ئومێد هاتە سەر باسەکەی.. باسەکەشی بریتی بوو لە سێ بەش، بەشی یەکەمی دەربارەی ئەو هەژاندن‌و راپەڕینەوە بوو کە عبدالله جوهر لە رۆژنامەی ژین سالی ۱۹٤۳ بەهۆی وتارێکەوە بەرپاس کرد، هەر یەك لە شاعیران پیرەمێردو ئەحمەد هەردی‌و فاضل محمد عرفان‌و م. تاڵەبانی و نوری بابە عەلی بەشداریان کردو گۆمی وەستاوی باری ئەدەبی ئەو سەردەمە بە هۆی ئەو گفتوگۆیەوە شڵەقاو ئەو دیاردە کۆمەلایەتی یە کە پۆشینی پەچە بوو ئەمان داوایان دەکرد نەمێنێ‌و سەردەمی ئافرەتی سفور بێتە کۆڕی ژیان‌و کارکردنەوە. بەشی دوەمی باسەکە دەربارەی

بابەتی ڕەخنە بوو لە ژیانی ئەدەبی عبداللە جوهردا کە لە گۆڤاری گەلاوێژسە بارەت بە نووسینێکی - ڕەفیق حیلمی - بڵاوی کردووەوە مامۆستا (ڕەمزی قەزاز)و (دڵدار) یش بەشداریان لەم باسە ڕەخنەییەدا کرد، بەشی سێیەمی باسەکە سەبارەت بە چۆنیەتی بەرهەمەکانی عبداللە جوهر بوو لە سەرەتای نووسینیەوە هەتا داخستنی گۆڤاری گەلاوێژ کە نووسەر وەرامی پرسیارێکی زۆری ئامادە بوانی دایەوە..

● لە باخچەی یەکێتی نووسەران و ئەدیبانی کورد - لقی سلێمانیو بەئامادە بوونی - بەشێکی زۆری ئەندامانی یەکێتی (٢٠٠) دینار درا بە شاعیری میللی گەورەمان (د. شۆ) بۆ چارەکردنی نەخۆشی یەکەی.

● لە کۆبوونەوەی ژمارە (٧)ی دەستەی بەڕێوەبردنی یەکێتی لیژنەی ڕۆشنبیری لەم زاتانە پێك هات:

| | |
|---|---|
| ١ - ئازاد عبدالواحد | سەرۆکی لیژنە |
| ٢ - دارا حەمە سەعید | ئەندام |
| ٣ - ئەحمەد سالار | ئەندام |
| ٤ - عثمان هەورامی | ئەندام |
| ٥ - د. شێرکۆ عبداللە | ئەندام |
| ٦ - عبدالکریم حسن | ئەندام |

هەروەها لیژنەی کاروباری کۆمەڵایەتیش لەم بەڕێزانە پێك هات:-

| | |
|---|---|
| - کەریم زەند | سەرۆك |
| ٢ - قادر حسێن | ئەندام |
| ٣ - ساجید ئاوارە | ئەندام |
| ٤ - س. ع. شادمان | ئەندام |
| ٥ - ئازاد مەحموود مستەفا | ئەندام |
| ٦ - شەهاب عوسمان | ئەندام |

هەروەها لیژنەیەك پێك هات بۆیادكردنەوەی (٢٠٠) ساڵەی دامەزراندنی شاری سلێمانی كە ئەم لیژنە یەش لەم بەرێزانە پێك هات:

| | |
|---|---|
| ١ ـ محەمەد ئەمین پێنجوێنی | سەرۆك |
| ٢ ـ شاكر فتاح | ئەندام |
| ٣ ـ ئەحمەد سالار | ئەندام |
| ٤ ـ نوری وەشتی | ئەندام |
| ٥ ـ ئازاد عبدالواحد | ئەندام |
| ٦ ـ عوسمان شەیدا | ئەندام |
| ٧ ـ كەریم زەند | ئەندام |
| ٨ ـ ساجید ئاوارە | ئەندام |
| ٩ ـ ئومێد ئاشنا | ئەندام |
| ١٠ ـ سەلاح محەمەد | ئەندام |

● رۆژی ٦/٢٨ كۆڕێكی چیرۆك خوێندنەوە سازكرا بۆ برای چیرۆك نووس مامۆستا (محمد رشید فتاح) كە كاك ساجد ئاوارە كۆڕەكەی بڕێوەبردو كاك ئومێد ئاشنا چیرۆكی یەكەمی هەڵسەنگاندو چیرۆكی دووەم بوو بە قسەو باسی ئامادە بوان و گفتوگۆیەكی زۆری لەسەر كرا... ئەوەی شایانی باسە جەماوەرێكی زۆری ئەدەب دۆست ئامادە بوون كە بەشی زۆری ئافرەت بوو...

هەروەها دەستەی یەكێتی نووسەرانی كورد لقی سلێمانی هەستان بەگێڕانی (پرسە)ی مامۆستای جوانەمەرگو ئەدیب و رۆژنامەنووسی كورد كاك بورهان قانع.. ئەوەی شایانی باسە ئەم پرسەیە لە مزگەوتی گەورە بووو بەشی زۆر دانیشتوانی شاری سلێمانی وەفادار هاتنە ماتەمی و پرسەی جوانە مەرگ...

● ● ●

**شەخسیەتێ باڤێنە دەر.**
**یەك شەخسی شول نایێتە سەر**
**یەك بن نەمینیت بێ ئەسەر**
**شولا ئومێدا مە ل سەر**
شەخسیەتێ باڤێنە دەر
یەك شەخسی شول نایێتە سەر
یەك بن نەمینیت بێ ئەسەر
شولا ئومێدا مە ل سەر
عەقلێ خوە بەر هەڤ كن هەمی

☆ ☆ ☆

دەست دەنە یەك شبی برا
هلكن ژ بو خوە یەك چرا
رییا كو تاری یە ژ مەرا
روناهی لازم ڤێ سرا
عەقلێ خوە بەر هەڤ كن هەمی

ع. هەكاری هوزانەك ب ناڤێ «**نالینا سێویەكی**»[٦] ڤەهاندیەو بەلاڤكریەو تێدا ژ دەڤێ سێویەكی كورد هەژاریو ستەمكاریا خوە دیار دكەتو دبێت:

**ئەز مامە سێوی، بێ داو بابم**
**خانیێ من سوتن، ئەز مالخرابم**
**بابێ من كوشتن، بێدین كوفاران**
**موحتاجم ئیرو دەستێ نەیاران**
**گورگێد دو پێ هاتن، كەتنە كەریان**
**موهاجرم ئەز، وێ كەتمە دەریان**
**نانەك دخوازم ژ بویێ ژینێ**
**رەحمێ ب من ناكن ژ خەیرێ كینێ.**

عبد الرحیم رەحیمی دەربارەی كومەلا پێشكەتنا پیرەكێن كورد ڤەهاندیە تێدا بەحسێ ژنا كورد دكەتو خەباتا وێ د گوهورینو سرربلندیا كومەلا

## السيد محافظ السليمانية المحترم
## السادة المسؤولين الكرام

استنادا الى ماجاء بكتاب محافظة السليمانية/ الحكم المحلي/ المكتب الخاص/ المرقم ٣ب/٢٧/١٤٢٢ في ١٩/٢/١٩٨٥.

تقرر عقد اجتماع موسع على غرار الاجتماع الذي انعقد مع فناني المحافظة وذلك لتسليط الاضواء على الامور المتعلقة بالقضايا الادبية والثقافة والمهنية التي تخص تأسيس فرع الاتحاد لاستئناف مسيرته وتطويره وذلك بحضور السيد محافظ السليمانية وعدد من المسؤولين والمعنيين في حقلي الثقافة والاعلام انها لمبادرة ايجابية قيمة تستحق التقدير تلك التي اقدم عليها المسؤولون لاحتضان هذه النخبة من خيرة ادباء المحافظة وما هذا الاجتماع الاّ بداية جديدة على طريق اتخاذ الاجراءات والمباشرة بالعمل لكسر طوق العزلة واجتياز حالة التردد لتجاوز السلبيات بروح نافذة وموضوعية في الوقت الذي كانت العلاقة بين الادباء والمسؤولين تسودها البيروقراطية وروح التعالي وتجاهل مطامح الادباء بل وابداء الشكوك من موقفهم والتعامل معهم بروح ينقصه الثقة وعدم مراعاة خصوصياتهم والتي هي جزء لايتجزاء من خصوصية مجمل الوضع السائد في المنطقة وايمانا منا بعدم اخلاء الساحة الثقافية لكل من هب ودب من الدخلاء على الكلمة الكردية وبغية هدم جدار الصمت جاءت رغبة الادباء في عقد هذا الاجتماع الموسع لوضع النقاط على الحروف ومواجهة الموقف مع المسؤولين بعد ان ادرك الجميع ان اختيار العزلة والصمت لايمكن ان يخدمان الحركة الادبية والفكرية وليستا في صالح المصلحة العامة.

ان الثقافة الكردية تعاني من حالة الركود والجمود في الوقت الذي يتطلب الأمر الى شحذ الهمم وضخ الدماء الجديدة الى شراينها واوصالها لدفعها الى أمام. وعدم فسح المجال امام النتاجات الهشة والهزيلة التي اكتسحت الساحة الادبية طيلة السنوات الاخيرة وانقاذ الثقافة الكردية من حالة التردي ـ لتتفجر ينابيع الموهبة الاصيلة والطاقات الابداعية للحاق بالركب الحضاري ومسايرة الادب الكردي للتقدم الاجتماعي والتطور الحاصل في عالم اليوم واضطلاع الاديب

الكردي بدوره الثوري - الطليعي في عملية بناء الانسان الكردي حضاريا وتغيير كيانه لكونه (شاهدا على عصره) لايكتب للاموات ولا للذين لم يولدوا بعد.

كما ولابد للاديب ان يمارس دوره القيادي بكامل حريته - ولا نقصد هنا الحرية الليبرالية - كون حرية الاديب جزء مهم من ابداعه، بل الحرية والابداع تؤامان. فهو يعرف اكثر من اي شخص آخر ان يتصرف بحريته بوعي ومسؤولية ازاء الكلمة، وهو المسؤول الاول والأخير عن قلمه، فلا يمكن رسم التخوم للاديب ونصب الاوصياء على ادبهم وفرض رغبات المسؤولين على نتاجهم، وسقوط هذه النتاجات في مهاوى المساومة والمجاملة على حساب الابداع والصدق والاصالة. لأن الاديب الكردي يعيش حالة نفسية خاصة والتعامل معه يحتاج الى المرونة والشفافية وينبغي اعطائه الحرية الكاملة للتخلص من التراكمات المخزونة في لاشعوره - في الاقل - والذي لحق به نتيجة الاضطهاد والقمع والمطاردة طوال سنوات وعقود مضت، ويتحسن هذا الواقع النفسي بالتدريج وليس بالانقلاب المفاجئ.

لقد اصبحت الحرية في هذه الايام قاصرة على نخبة معينة من محرري الصحف والمجلات وبعض الاسماء دون غيرها، اما بالنسبة لبقية الادباء فهي غير مسموح بها بحجة انها ضرب من الفوضى، حتى لو كانت طروحاتهم اخف من طروحات هذه القلة القليلة. اي ان الحرية مسموح بها لمجموعة معينة من الاسماء يتم اختيارهم وفق وجهة نظر وامزجة محرري الصحف، ليكتبوا مايشاؤوا وتصادر حرية التعبير عن الرأي بالنسبة للبقية الباقية.

ان صلاحية ممارسة الحرية لفئة المثقفين شملت (رقابة المطبوعات) ايضا، فأنها تمارس عملية رفض وشطب الصفحات وفق الاذواق والامزجة وعملية رفض النتاج ناتجة عن القصور في فهم الموضوع وعدم استيعابه بشكل جيد، وان تعرض الكتب الكردية للرفض والقبول قابلة للمد والجزر. فقد تمنح الموافقة على طبع بعض الكتب الكردية لاسماء معروفة ولا ينفلت نفس المواضيع من مقص الرقيب بالنسبة لشخص آخر، وان رفض بعض الكتب قابلة للموافقة عند اعادتها للرقابة بعد مرور شهر واحد، وهذا يدل على ان الرقابة ليست لها اي اسس متعارف عليها في رفض النتاج وقبوله، وتلعب الصداقة والمجاملات لعبتها في عملية الشطب والرفض والموافقة، فنقترح اعادة النظر في امر رقابة المطبوعات بشكل جدي لتجنبها مسألة الازدواجية ونقلها من بغداد العاصمة الى الأمانة العامة للثقافة والشباب.

وبناء على ماتقدم نلخص لكم مقترحاتنا وتصوراتنا لتجاوز هذه المعوقات آملين تلافيها والأخذ بها بنظر الاعتبار.

* ان الديمقراطية الحقة تتطلب من المسؤولين ان يتشاوروا مـع الادباء في قضاياهم واموزهم المتعلقة بالادب والثقافة الكرديين، قبل اتخاذ القرار النهائي واعلانه وذلك من خلال اجراء الحوار الهادف والموضوعي لتحديد الصيغ المثلى لخدمة الواقع الثقافي الراهن ومستقبل الثقافة القومية.

* يجب ان يكون للادباء حصانة اجتماعية وان يكون للاتحاد شخصية من واجبها ان تدافع عن اعضائها وان تتدخل في شؤون افرادها عندما يتطلب الأمر ذلك وخاصة في حالة الضرورة والاستدعاء. وحتى مسألة الاستدعاء لأي عضو من اعضاء الاتحاد يجب ان يتم عن طريق الاتصال بالاتحاد نفسه.

* ان يكون التعامل مع الاديب الكردي متساويا مع الاديب العربي.

* دراسة واقع مديرية رقابة المطبوعات واختيار المؤهلين لاناطتهم مسؤولية تدقيق المطبوع الكردي.

* فتح دورات لتعلم اللغة الكردية من قبل الاتحاد، وذلك لتعلم واطلاع الادباء العراقيين على اللغة الكردية وآدبها فهي اقرب اللغات اليهم وان الشعب الكردي اقرب الشعوب اليهم (ارضا وتأريخا وحضارة) بـدل توجههم الى تعلم اللغـات الافريقية.

* تخصيص صفحات من الصحف والمجلات المحلية للادب الكردي وتعريفه بالقراء. وتكليف الادباء الاكراد المتظلعين في اللغة العربية بهذه المهمة، علاوة على ترجمة النتاجات الادبية من الشعر والقصة والدراسة الى لغة الضاد ومنها الى اللغات الاجنبية لتعريف واقع الثقافة الكردية بالشعوب وخروجه من قوقعته وزيادة رقعة قرائه، وان يتم طبع هذه الكتب من قبل وزارة الثقافة والاعلام وفق خطط مبرمجة سنوياً.

* الأستشارة بالادباء، وعرض النتاجات عليهم عند تقديم البرامج الادبية، لان اغلب مقدمي هذه البرامج لايجيدون اللغة الكردية وغير ملمين بجوانبها بشكل مطلوب لذا يقعون في اخطاء فادحة عند تحدثهم عن الثقافة الكردية وحقولها نتيجة النقص في المعلومات والعجالة في التفكير، ويقدم هؤلاء انطباعاً مشوها عن الادب الكردي ويظن المشاهد والمستمع ان هذه البرامج جاءت لتشويـه صورة الادب الكردي وليست من اجل خدمة الثقافة الكردية واغنائها.

* تغطية كافة النشاطات الثقافية في كردستان في البرامج الثقافية والصحف والمجلات دون تحريفها والتلاعب بمضامينها.

* أحداث فرع للمركز الوطني لحفظ الوثائق في احدى محافظات كردستان

على ان يتولى مسؤولية هذه الدائرة اشخاص لهم علاقة مباشرة بهذا الجانب المهم، للاهتمام بالتراث الوثائقي وجمع المخطوطات من مختلف مناطق كردستان، وتعميم كتاب رسمي للاهتمام بالاوراق والاضابير الموجودة في الدوائر وعدم احراقها الا بعد التدقيق والفرز من قبل المختصين.

* اصدار مجلة كردية للاطفال للاعتناء بتربيتهم وقراءتها بلغة الام.

* استحداث (مديرية التراث الكردي) او جعل (المتحف الاتنوغرافي الفلكلوري) الموجود في السليمانية دائرة تأخذ على عاتقها جمع التراث الكردي المبعثر وصيانته خوفا من التلف على ان يكون مرتبطا بالأمانة العامة للثقافة والشباب، واصدار مجلة خاصة تعني بالفلكلور والتراث كمجلة التراث الشعبي.

* الاهتمام بمسألة التوثيق والارشفة، وذلك عن طريق تخصيص الكاميرات واجهزة الفيديو لاجراء المقابلات مع الشخصيات السياسية والادبية والاجتماعية. والتقاط الصور للمعالم الاثرية والتراثية والاثنوغرافية قبل فوات الاوان.

* تخصيص مطبعة (الثقافة التابعة للأمانة العامة للثقافة والشباب) بشكل اوسع لخدمة المطبوع الكردي في حالة عدم تلقي المؤلف الكردي تعضيدا من قبل الجهات الثقافية لطبعه على نفقة الأمانة بعد عرضه على الخبراء والمختصين في حقل الادب، لانقاذ الادباء من محنة الطبع وهموم المطابع.

* فسح المجال امام الادباء والمبدعين الاكراد لمشاركتهم في المهرجانات والمؤتمرات الثقافية خارج وداخل القطر وبالاخص مؤتمر الافرواسيوي وترشيح بعضهم لنيل جائزة (لوتس).

* لاشك ان هناك الكثير من المبدعين ورجالات الثقافة والصحفيين، كرسوا حياتهم وقدموا عصارة جهودهم لخدمة المسيرة الثقافية، فنقترح من الجهات المعنية ان تجعل من مساكنهم واماكن عملهم وممتلكاتهم متحفا صغيراً ليتوافد عليه الزوار ويطلع على آثار هذه الشخصيات الادبية.

* تكليف بعض الفنانين الاكراد - النحاتين منهم - ان يباشروا بصنع مجموعة من التماثيل للشخصيات الثقافية والادبية وثم توزيعها على ساحات وشوارع المدن الكردية عرفانا منا بالجميل وتخليدا لذكراهم.

* ارسال الادباء الاكراد بين آونة واخرى الى خارج القطر وذلك لالقاء المحاضرات حول الادب الكردي وتعريف اتجاهاته في المحافل الثقافية عن طريق الحلقات الثقافية اسوة بالأخوة الأدباء العرب، لتبادل الخبرة وانفتاح الاديب الكردي على المعطيات الثقافية للشعوب بشكل حيوي وعن كثب.

* تشكيل لجان للمسح الفلكلوري واخرى للمسح اللغوي لانتقاء المفردات

الكردية الاصيلة من افواه الشيوخ في الاقضية والارياف والتي يكاد الزمن ان يقضي على اغلبيتها والمتعلقة بالزراعة والصيد ومواسم الحصاد والطب الشعبي والجوانب الحياتية الاخرى نتيجة الغزو التكنولوجي.

* تخصيص ميزانية خاصة لاقامة الندوات والمهرجانات والملتقيات الثقافية.

* منح الادباء زمالات دراسية للالتحاق بالدراسات العليا للحصول على ثقافة اكاديمية.

* معالجة الادباء الاكراد اثر اصابتهم بالامراض داخل القطر او خارجه عند الحاجة.

* اصدار مجلات كردية اخرى لاستيعاب نتاجات الادباء في المحافظات الكردية وتشجيع نتاجات الشباب لتفجير طاقاتهم والأخذ بيدهم.

* محاولة اصدار جريدة يومية كردية لتغطية الاحداث، انها امنية تراود جميع الادباء.

* تشكيل لجنة لمتابعة الفقرات التي وردت في هذه المذكرة، لتحقق ماجاء فيها ان الثقافة الكردية لايمكن ان تزدهر وتضطلع بدورها مالم تعالج مشاكلها بشكل جذري لاجتثاث جذور سلبياتها.

نحن اليوم بأمس الحاجة الى التشخيص السليم الذي يرافقه الصدق في لطرح دون اللجوء الى المجاملات والاهواء والمصالح الذاتية، رغم ان التشخيص لسليم يتسم احيانا بالحدة والانفعال، الا ان هذا الانفعال هو الحرص على تقدم لثقافة الكردية وتجاوز واقعها......

**نخبة من أدباء السليمانيه**

## السيد وزير التربية المحترم

ننقل لسيادتكم خالص تحيات وتمنيات الادباء الكرد ونعرض على سيادتكم أمر الدراسة الكردية في محافظة دهوك التي مرت بمد وجزر بعيداً عن الاسس التربوية وقرارات القيادة السياسية حيث كانت حتى الاونة الاخيرة خاضعة لتفسيرات وأهواء القائمين بها واخضعوها لاعتبارات شخصية خارجة عن الاسس التربوية وستراتيجية الثورة بمنح الحقوق الثقافية للشعب الكردي بعد مضي سنة واحدة على قيام ثورة ١٧ - ٣٠ تموز المجيدة ومن ثم توجتا ببيان الحادي عشر من آذار الخالد وقيام مؤسسات الحكم الذاتي لتؤكد الاصرار على المضي على النهج الذي خططته الثورة والحزب، ولكن رغم كل هذه التشريعات الواضحة تعثر تطبيق الدراسة الكردية في محافظة دهوك سنين عديدة وشكلت اللجان التحقيقية من قبل القيادة والجهات المسؤولة للتعرف على العقبات والعراقيل ميدانياً والتوصل الى الاسس السليمة لتطبيق قرارات القيادة، وصدر قرار من قبل مجلس قيادة الثورة الموقر بتطبيق الدراسة الكردية في محافظة دهوك وعمم القرار بـالامر الوزاري المؤرخ في ١٩/١١/١٩٨٤ بوجوب تطبيق قرارات مجلس قيادة الثورة وتطبيق الدراسة الكردية في مدارس محافظة دهوك، وقد كان السيد المدير العام للتربية في محافظة دهوك أهلاً لتطبيق القرار المذكور بحذافيره وتم على الفور تحديد (١١) احدى عشرة مدرسة في مركز مدينة دهوك و (٢) مدرستين في سميل و (٤) أربع مدارس في زاخو و (١) مدرسة واحدة في العمادية مراعياً في ذلك التوزيع الجغرافي لابناء القومية العربية وغير الاكراد من الاقليات الدينية تمشياً مع الفقره (جـ) من المادة الثانية من قانون الحكم الذاتي والذي ينص على (تنشأ مرافق تعليمية في المنطقة لابناء القومية العربية يكون التعليم فيها باللغة العربية وتدرس اللغة الكردية الزامياً) ولكن بعد تطبيق القرار الوزاري بأسبوع واحد زار السيد الامين العام للتربية والتعليم العالي لمنطقة كردستان محافظة دهوك وعقد اجتماعاً مع مدراء المدارس الابتدائية والمشرفين التربويين والمسؤولين أعلن فيه بأن الدراسة باللغة الكردية اختياري ويمكن الجمع في مدرسة واحدة بين شعب للدراسة العربية والكردية وأدى ذلك الى قيام بعض مدراء المدارس بتغيير الدراسة بصورة ارتجالية وفورية وفتح شعب عربية وكردية في مدارسهم والبعض الاخر بسحب الكتب

الكردية من مدارسهم وتوزيع الكتب العربية وبذلك أعيد الوضع التربوي لمدارس مركز مدينة دهوك الى مايشبه الوضعية قبل صدور الامر الوزاري المذكور، ولن يستفيد من هذه الوضعية غير المستقرة سوى أعداء العراق وثورته الذين يتاجرون بالقضية الكردية منذ سنوات وانطلاقاً من اخلاصنا للثورة التي منحت الحكم الذاتي وأصرت على قيام مؤسساته عرضنا الوضع بحقيقته لسيادتكم مقترحين بأن تبقى الدراسة باللغة الكردية في المدارس التي تم تحديدها من قبل المديرية العامة للتربية في دهوك والغاء الجمع بين شعب عربية وكردية في مدرسة ابتدائية واحدة الا في حالات الضرورة القصوى والتي تؤدي الى ضياع الجهد التربوي ويفوت الفرص على الذين يريدون التصيد في المياه العكرة والمزايدات الكلامية وبتطبيق الدراسة الكردية يتم سد الكثير من الفجوات والثغرات التي من خلالها حاول ويحاول الاعداء أن ينفثوا بسمومهم السوداء القاتلة لتمزيق وحدة هذا المجتمع المتراصي والمتلاحم وتشتيت هذا الشعب العظيم الذي يفتخر به السيد الرئيس القائد (حفظه الله) في كل المناسبات ولسيادتكم فائق شكرنا وتقديرنا.

**فرع كردستان**

**لاتحاد الادباء والكتاب الكرد**

**صورة منه الى/**

**قيادة فرع الشمال لحزب البعث العربي الاشتراكي**

**المجلس التشريعي لمنطقة كردستان**

**المجلس التنفيذي لمنطقة كردستان**

کوردەوارىَدا چەندە. هوزانا «**ژ بو جڤاتا دایکان**»[7] کریە دیاری ژ وان راو دبێت:

**پرسی ژ عەسرێ دەوران: فەن‌و تەرەقیا تە**
**دەولەت سررێ چ یە؟ گوت: دەولەت سەرێ ژنانە**
**لەورا قەد ناحەون ئەو، شەڤ‌و روژ ئەوان خەباتە**
**جا زاریەك مەزن کن، ژینا وەلات ب وانە**
**ئینسان ب ئەسلێ فترەت نە قەنج، نە خرابە**
**قەنجی‌و خرابیا مە ب راکرنا دیانە**
**گوتن فەکرنە دایکان جڤاتەکێ بلندی**
**یارەب تو پێکڤە بینە، تەوفیقەکێ دە وانە**
**«رەحمی» نەدیت کو لایق تەقدیم بکەت هدیة**
**هەدیە گەر قەبول بت، وی دایە جسم‌و جانە**

**عبدالرحیم رەحمی هێرشە کا توندو دژوار دبەتە سەر نەزانینێ‌و** دیار دکەت کو پاشکەتنا مللەتا سەمەدی (سەبەب) نەزانینێ یە لەورا هوزانەك ڤەهاندیە لژێر ناڤێ «**نەزانین**» تێدا وەها دبێت:

**ئەی جەهل‌و نەزانین، تویی دوژمن، تویی خاین**
**زولما تەیە هێلان هەمی بێ سنعەت‌و بێ دین**
**قەهرا تەیە وێرانە کری ئاها، وەتەنێ من**
**کینا تەیە بێلانە کری جیسم‌و تەنێ من**
**سەروەت تە ژ مەستاندیە، بێ مال‌و دراڤن**
**ئەم ماینە بەلنگازو فەقیر، خانە بەلاڤن.**

بەلێ هێش بیهنا وی ب شیرەت‌و داخوازیا نابێت. گازی دکەت‌و بانگی هلدێریت‌و هوزانەك بناڤێ «**بانگ**»[9] ڤەهاندیەو دبێت:

**هیشار بوم ئەز، دنیا هەمی کەڕ**
**ب دەنگێ مەلایی، «الله ئەکبەر»**
**«الله ئەکبەر» دەنگێ منارێ**

«رابن» دبێژیت، هەر وەك هەوارێ
«رابن» دبێژیت، وەقتێ سبێ یە
ساحب خەباتان، شەیتان لە پێ یە
مەخلوب نەبن هون ژ دەستێ لە عینێ
بونا خوەدێ یەرابن بچینێ
پاقژ بکن خوە ژ کێمێ و قرێژێ
حازر ببن هەم بونا نوێژێ
حازر ببن و عەفوا قوسوران
کو خالقێ وە، وە دخوازتە دیوان
وەخت تەنگە، لەزکن بگەهنە مزگەوت
ل پێ مەلایی، هێژ روژ نەدەرکەوت
ئەمرێ خودێ خوە ئەم پێکڤە بینن
جا خەلق نە بێژیت «بێ حسن و دینن.»

میرێ هەکاریا ژ تەخا خوندکارو دەرەبەگ خوە ڤەتقەتینیدو هێرشەکا دژوار دگەل تەخا رێنجبەرو بندەست دبەتە سەر کوجك و تەلارێد وان. هزوو بیرێد خوە بێد وان ڤەکرێدەت دەمێ ڤێ ئێکی ب هوزان دەردکەت لبن ناڤێ «**قەوی ب خارنا زەعیفان د ژین**»[١٠]:

سبێ وەکی چومە خەبات
قیژکەك مە دیت، چو لێ دهات
کرمەك دناڤ دمکی ڤەشارت
لەزبو، ب هێلینێ نێ کیهاند
دنکەك ب هێلینێ وەهات
شاهیانە بو کەفتە وەلات
زارێ ئەوان تێك قژقژی
کرمك گو کر وی قژی
تەقسیم زاریان کرو ڤەژی
خوارن ئەوان، بون تێر تژی
چوچك ب وێ «نێچیر» دژی
کوشتن نەبا، نێچیر نەد هات

ژینا ڤیژك بمرنا وی یه
کرمك نەبت، ڤیژ برچی یه
برچی، حەیات روژا سی یه
ژ غیری سیان مومکن نیه
ژینا ئەوان ب نێچیري یه
لەورا کو کرمك کوشت، هلات
کیشکا ڤەوی، نێچیرڤان
کیشکا زەعیفه بێ ئەمان
کوشتن ژ بو بێ ڤودرەتان
خەلق کریه خالق، ڤەنج بزان
گەر ژین دخوازی ڤی زەمان
ڤوەت تەرا ژینو حەیات

ع. رەحمی هێش دەردێ دلێ خوه دیار نەکریەو کینا وی نـه فەمـریه ب هوزانا «عەشقا وەلات» دەر دکەتو ئاشکەرا دبیت کو نیشتمان پەروەرەکێ بێ بەڤله دوی جاخی دا. ئاخینك ژ بنێ پێدوی تێن بو رەش کونێد کوچەرا لزوزانێد فەراشینو تویزەرکا، ژبو گوڤەندید ئەسمەرو بسك ب تێلا دەمێ لپەرێ کونا تێن بەستن لبەر کەڤێد بەڤرێ دناف تەڤریو هەلزێ دا حەیرانوکا دهاڤێنه بەر ئێك. جەرگو مێلاکێد هەکاری د سوژن بو ژینا کوردەواری و دبیت:

### عەشقا وەلات[١١]

بوهار هات، شین بون گیا
جل بەر کرن، خەملین چیا
گەشتان بکن سەر کانیا
ژخیزێ دجیت شبهي زیبا
براق، پاك، صافیا
عەشقا وەلات عەشقا وەلات
تە چەرگ، مێلاکێ مە پات

☆ ☆ ☆

جارەك دی من دیبا خوەزی

کونێد رەش کەرییێد پەزی
تو ماست لسەر ئاڤێد تەزی
زەرییێد وەکی سیرمە کەزی
ل پێرێ ل پەی بزنان دبەزي
عەشقا وەلات عەشقا وەلات
تە جەرگ، مێلاکێ مە پات

☆ ☆ ☆

بوچی ژ تە ئەم بون جودا
مە تەرك کرن لەزەت. سەفا
شاهان کوچە دانە گەدا
هاتن لبن خانێی مەدا
تەرکا تە کر بونە خودا
عەشقا وەلات عەشقا وەلات
تە جەرگ، مێلاکێ مە پات

☆ ☆ ☆

کانێ وەلاتێ سەرحەدان
سوتن ئەوان ئاتەش گەدان
لەورا کو گور بونە شڤان
دەنگێ بلولان، نالیان
دەنگێ هەواران، گازیان
عەشقا وەلات عەشقا وەلات
تە جەرگ، مێلاکێ مە پات

☆ ☆ ☆

دەنگەك تونە شولەك عەجیب
ئەم مانە سەرگەردان، غەریب
دور بون ژ وەلاتێ دل قریب
جارەك دی دێ بیتە نەصیب
جونا ل وێ رەبێ موجیب

عەشقا وەلات عەشقا وەلات
تە جەرگ، میلاکێ مە پات

☆☆☆

دبێژن وەلات بو دژمنە
ئەز ساخ ببم قەد مومکنە !
خیرەت، حەمیەت زامنە
عەشقا وی مهڤانێ منە
قوربان ژوی ڕا مەرگێ منە
عەشقا وەلات عەشقا وەلات
تە جەرگ، میلاکێ مە پات

## ژێدەر


١ - جەگەرخوین - فەرهەنگا کوردي ژمارە ئێك لاپەرە (١٥٧)
٢ - جەگەرخوین - فەرهەنگا کوردي ژمارە دو لاپەرە (١٣٥)
٣ - د. کمال مظهر أحمد - تێگەیشتنی راستی لاپەرە (٤٨، ٤٩، ٩٥، ١٥٦).
٤ - ژین ژمارە (٢١) لاپەرە (١٥ - ١٦)
٥ - ژین ژمارە (٥) لاپەرە (١٤)
٦ - ژین ژمارە (١١) لاپەرە (١١ - ١٢)
٧ - ژین ژمارە (٢٢) لاپەرە (١٦)
٨ - ژین ژمارە (١٧) لاپەرە (١٧)
٩ - ژین ژمارە (١) لاپەرە (١٢)
١٠ - ژین ژمارە (٢) لاپەرە (١٣)
١١ - ژین ژمارە (٣) لاپەرە (١٤)


## تێبینی:

هێژا (محمد أمین بوزأرسلان) ئەڤ کوڤارە یاتویژاندیو بوینەپێنج جلد. جلدێ ئێکی پێنج ژمارێد کوڤارێ دگەل پێشەکیەکێ ژ (٨٧) لاپەرا پێك تێت یا ژمن را دیاری کری. من ژی سود ژ ڤی جلدی کر بو ڤێ کوتارێ. هیڤیدارم جلدێد دی ژی بدەست من ڕا بکەهن.

**هەیڤ و عاشق**
**رهین ژینێ**

# هەمیشە بەهار

د. ئیحسان فوئاد

برادەرو هاودەمی حەوت ساڵەی خوێندنی دوور وڵا تیم دکتۆر عیزەت[1] موستەفا ڕەسووڵ لەم چەند ڕۆژەدا بەگەرمیەوە داوای لێکردم،کە دەربارەی ماموستای جوانەمەرگم ئۆستاد[2] بەشیر موشیر «هەمیشە بەهار»ێ[3] بنووسم. پاشان لەمەیش زیاتر هەنگاوی نا، وتی:

**- حەز دەکەیت منیش چێم پێ دەکرێ لەم مەیدانەدا یارمەتی دەدەم.**

ئەمە ڕاستی پشتگیری‌یەکی برایانە بوو کە لە هەستێکی گەرمی بەسۆزەوە هەڵدەقوڵا. بەڵام تاڕادەیەك منی پەست و دڵگیر کرد، چونکە نە بیروباوەڕی ماموستام (ئوستادی نەمر)[4] هێندە تەنك و درشتە کە منی تیادا ڕابمێنم، نە منیش خوانەخواسته هێندە کەمتەرخەم و بەرەڵڵام کە یادی ئەو فەراموش بکەم، چونکە لە هەموو بابەتێکا قەڵەمم سست بنوێنی، لەم مەیدانەدا «قەلەمم[5] بەقوەتە»وتا بڵێی گورج و گۆڵ و دەستەویەخەیە.

× × ×

ڕاستی ئەمە دوو ـ سێ ساڵە لە کۆڕە ئەدەبی‌یەکانی وەرزی ڕۆشنبیریدا لە دهۆك و سلێمانی و هەولێرو کەرکوك و بەغداد برادەرانی دوورو نزیك کێشەکانی ئەم فەلسەفەیە[6] دەدوێن، پرسیاری گەرمیان ئاراستەی من دەکەن. منیش وا بەشێ لە زنجیرەی ئەو هەموو پرسیارانە[7] لێرەدا وەرامدەدەمەوە لە سنووری تێکەیشتنی خۆمدا وەك سکوولەرێکی[8] هاوچەرخ و ڕێبازگری خەتی ئەو فەلسەفەیەی بەلای ئێمەوە لە جەرگەی نەتەوە هەڵقوڵاوە کاڵایەکی باڵایە بۆ چارەسەرکردنی زام و برینەکانی.

پرسیاری یەکەم:

**ئایا دەشێ پێناسینێ بۆ ڕێبازکەو باری سەرنجی ئوستاد دابڕێژین کە تاڕادەیەك تینوێتی بەشیریستە لاوەکان بشکێنێ ؟**

وەرام:

بەلای ئێمەوە بەشیرستە لاوەکان هەریەکەیان بەپێی کۆششو زرنگیی خۆی شتێ لە فەلسەفەی ئوستاد ڕاییبووە. تاقیکردنەوەی ڕۆژانە، ناکۆکییەکانی ژیان لە چینایەتیو کۆمەلایەتی ژانو ئەشکەنجەو ڕارایی لەنێوان دووڕێیانەکانداو سێپێیی هێندێكو بەرەللاییو خزانی بەرەو دیهلیزێ بتپەرستی، هەنگاو بەرەو هەورازو گلۆربوونەوە بۆ نشێو بە ئارەزووی پواز... ئەمانە هەمووی لە هەوێنی خاوێنی سەرنجی هاوچەرخی بەشیریستەکانو وەکوو پیرۆزە شین دەچنەوەو جاروباریش لە تەریقییا دەبریسکێنەوە. ئەوەی یاغنیش[9] نەبێ خۆی لیێ حالێ دەبێ.

بەلام دیسانەوە ئەتوانین بلێین کە فەلسەفەی بەشیریزم هەر پێویستی بە نیمچە پێناسینی هەیە با بە قەلەمی درشتیش بێ.

**بەشیریزم چیپە ؟**

بەشیریزم جۆرە لیدوانێکی گشت لایەنییە لە شۆڕەسوارییە کارەساتاوێکانی نەتەوە، کە لە نائومێدیەوە مرۆڤ دەبات بەرەو جیهانێکی خەمڕەوێن، بەوەی گریان دەکات بە زەردەخەنە، زەردەحەنەش بە پێکەنین.. وەك ئالایەك خەونە مەزنەکانی نەتەوە ڕادەژەنێو دەیخاتەوە شنەشن، تا لەئەنجامدا دەگاتە گەشترین[10] لووتکەی ڕێڕەوی نەسرەوتن، بەیارمەتی یەزدانو، کوێرایی چاوی دوژمن...

پرسیاری دووەم:

**بنەڕەتە هەرە پتەوەکانی ئەم ئایدیۆلۆژییە چیپە ؟**

**وەلام:**

پەنابردنە بەری ئەم تێڕوانینە بەرەو هێندێ گێژلووکەی بەتینو ڕووبەڕووبوونی هێندێ کۆسپی ناکەهانو خوارو خێچ لەوانەیە ناکۆکییەکی بەڕوالەت دیاری[12] بۆ بەرپا کردبێ. بۆیە ئەندامێکی کۆمەلی «حەوتەوانەی مژدەبەر»[13] لە هەولێکی بزورگو چالاکیدا دەلێت: «مامۆستا بەشیر موشیر ئەو زاتە پیرۆزەیە کە بەدرێژاییی تەمەنی درێژی هەرگیز درۆی نەکردووە، هیچ وەختێکیش ڕاستی نەوتووە»[14]

بەلای ئێمەوە ئەم بۆچوونە دروستە، میتافیزیك[١٥] نی یە، وەكو بەڕواڵەت دیارە، لەودیو واتاكانێوە ئەگەر بە قووڵی سەرنجی بدەی، جەمسەرەكانی تا بڵێی كۆك و پتەوەو هیچ ناكۆكی یەك لەم ڕستە خەست داڕێژراوەدا نی یە !

بۆ ڕوونكردنەوە دەڵێم:

لە فەلسەفەی ژیاندا بە واتا فراوانەكەی لەووەختەوە ئادەمیزاد لە ژیانی تاكێوە ملی خزان بەرەو ژیانی كۆمەڵایەتی، درۆو ڕاستی وەك خوشك و برا هاتنە كایەوە.[١٦] لە كتێبە پیرۆزەكاندا درۆو دەسیسەو هەڵخەتاندن خراوەتە بەرگێكی ناونراوەوە كە پێی دەوترێ «شەیتان»و «ئەهریمەن». جگە لەوەی وەك ڕاستی یەكی بەڵگەنەویست[١٧] درۆ هێندێجار بە كۆچانی ڕاستیوە خۆی هەڵدەسپێرێ. هەر بۆیشە لە فەرهەنگی نوێی ڕامیاریی بەشیریستەكاندا درۆ بەرامبەر بە تاكتیك دەوەستێ و ڕاستیش بەرامبەر بە ستراتیج، واتە: لەپێناوی ڕاستی چەسپاندندا درۆكردن ڕەوایە. ئەمە بەشەرعی پێغەمبەرانیش ڕێی پێ دراوەو لەوە دنیا سزای نی یە. بەمجۆرە درۆیانە دەوترێ درۆی خێرخواه یان درۆی پیاوانە، بەڵام بەپێچەوانەوە ئەگەر لەپێناوی درۆدا ڕاستی بووترێ، مامۆستا وتەنی، عیندەل ئیجاب بە دینی پێغمبەر[١٨] لەپاشانا ڕیسەكەی دەبێتەوە بەخوری چونكە پەتی درۆ قرچۆكەو لەپاشاندا هەر دەپچرێ، یان وەكو كورد وتەنی: «هەزار ساڵ بكەی درۆ هەڵبەستی، ئاخری هەر دەهێنی نوشوستی».[١٩]

بۆنموونە بڵێین تۆ ـ خوانەخواستە ـ بۆ نیازێ دە پانزە ساڵ لەمەوبەر درۆیەكی زلت كرد، لەوانەیە عالەمێ بێت هەڵبسخەلەتێ و ئافەرینت بكات و سەمات بۆ بكات، بەڵام لەپاش ماوەیێك بڵێین دوو ساڵ، چوار ساڵ، پێنج ساڵ ئەو درۆیە هەر ئاشكرا دەبێت. ئەو وەختە لە گرمەو كێشەو رووزەردی زیاتر هیچت بۆ نامێنێتەوە. كەواتە بۆچوونەكەی برادەری ناوبراو بە یەكێ لە ئەندامانی «حەوتەوانەی مژدەبەر» یان «مژدەبەخش»، هەرچەند بە ڕواڵەت ناكۆكە، بەڵام بە گەوهەر[٢٠] وانی یە.

پرسیاری سێهەم:

**بوچی زۆرجار بەشیرستە مژدەبەرەكان داستانی ڕووداوەكانی ئوستاد دەخەنە قاڵبێكی گاڵتەوگەپ و نوكتەوە ؟ ئایا ئەمە لە جیددی یەتی فەلسەفەكە كەم ناكاتەوە ؟**

وەرام:

بەلای ئێمەوە دیسان مەسەلەکە نەختێ تێڕوانینی قووڵتری دەوێ. ڕاستی ئەم گیانە کۆمیدی‌یە، ئەم ڕووکردنەی پێشەوای ڕۆحیمان لە دونیای قەلەندەری‌و پێکەنین، لە واقیعێکی گەلێ تاڵ وپرژانی نەتەوەکەیەوە هەڵدەقوڵێ. ئەمە خۆبەختکردنێکی جوانمەردانەیە، کە سۆزی خۆشەویستی‌یەکی پاکی تیایا دەدرەو شێتەوە.

کەس لە سەرحەددی بیابانی مەحەببەت نەگەیشت
وەکو من سالیکی ئەم ڕاهە هەموو حەیرانن
ڕێی حەریمی حەرەمی عیشقی نی‌یە سپلەیی دز
پاسەوانی سەری ئەم کۆیە جەوانمەردن

کەواتە ئەم گیانە ڕۆحسووکی‌یەی ئوستاد جێی شانانی‌یە:

شەهادەی فەخرە فەقرم، بۆ شەرەف بۆتە عەلاماتم[٢١] ئەمە شوکرانەی دەوێ برادەران ! بەس نی‌یە بەشێکی زۆری بەسەرهات‌و قسە نەستەقەکانی ئوستاد دەمانخاتە جیهانێکی باڵەفڕکێی ڕۆحسووکی‌و خەمڕەوێنی‌وە لە چەرخێکدا کە زوربەمانی کردووە بە مەیموون‌و... ناو جۆگاکە ! ئەلێم بەس نی‌یە یادگارەکانی ئوستاد دەمانخاتە پێکەنین‌و نەختێ هەوای باڵی خۆمانی پێ دەدەین، لەکاتێکدا بەسەرهات‌و کارەساتی هێندێ پاڵەوانی بەدبەختی‌کە نەك هەر تنۆکێ شادمانیمان پێ‌نابەخشێ، بەڵکو زۆرجار وا زام‌و برین‌و ژانەکانمان دەکولێنەوە کە ئەگەر لە شایی‌و ڕەشبەلەکی ڕۆژێکی سەرەتای مانگی نەورۆزیشدا بین، بیرمان‌کەوێتەوە، میزاجی کوردەواریمان وا پێی تێکدەچێ دەمانخاتەوە گریان‌و شین‌و قورپێوان.

دەبێ ئەوەشمان لەبیرنەچێ کە ئەم لایەنەی فەلسەفەی ئوستاد نووکی ڕمی گەشبینی‌یەکە Optimism[٢٢] ئاراستەی جیهانی پف‌هەڵدراوی بت‌و بتەوانەکانەو هیپوکراتیی تەشی ڕێسەکانی ئەم چەرخە دەگرێتەوەو هەر بە هەمان ڕادەش ڕیسوایان دەکاتن.

## پەراوێزەکان .

١ ـ «عیزەت» بەکارهێنراوە چونکە ئوستاد هەر بەمناوە ناوی دکتۆر عیزەدینی بردووە. ئێمەش لەبەر ئەمانەتی عیلمی هەر بەوجۆرە هێشتمانەوە.
٢ ـ بەلای منەوە ئوستاد وەختێ جێی هێشتین، کە زۆر پێویستمان بە مانی هەبوو. لێرەدا تەمەنمان نەکردووە بە پێوانە، بۆیە لەلای بەشێریستەکان مامۆستا هەر بە جوانەمەرگی کۆچی دوایی کردووە لە ئێوارەیەکی غەمگینی ڕۆژی ١٩٦٣/٧/٣٠ لە پایتەخت.
٣ ـ «هەمیشە بەهار» مەبەست لە هەموو یادکردن و لێکۆڵینەوەیەکە لە بیروباوەڕی مامۆستا کە هەرگیز پیری بەخۆیەوە نابینێ، فەلسەفەی هەموو کات و زەمانێکی نەتەوەیە ئایا لە گەرمیان بێ یا لە کوێستان.
٤ ـ ئوستاد: نازناوێکە لەلایەن پیرەمێردەوە بەخشراوە بە مامۆستا بەشیر موشیر. ئەم زانیاری‌یەمان لە مۆزەخانەی لەندەنەوە پێگەیشتووە. سوپاسی د. عیزەت دەکەین.
٥ ـ بۆ تێگەیشتنی «قەلەمی بەقووەت» تەماشای گۆڤاری نووسەری کورد، ژمارە (٥)، ساڵی ١٩٨١، ل ١٤٤، بکە.
٦ ـ فەلسەفە: لەلای هێندێ زاناو پسپۆر بیروباوەڕەکانی ئوستاد پەیوەندی‌یی بە سۆشیۆلۆجی و لاهوتیشەوە هەیە، جگە لە فەلسەفە.
٧ ـ پرسیارەکان بیست‌ویەك پرسیارن. خوا یار بێ لە هەر ژمارەیەکدا چەند پرسیارێ وەرامدەدەینەوە.
٨ ـ Scholar مەبەست باحیثە.
٩ ـ «یاغنیش» نەزان، نەشارەزا، خەشیم، لە وشەزاراوە تایبەتی‌یەکانی ئوستادە.
١٠ ـ کەشترین: بەرزترین
١١ ـ بنەڕەت: ئەساس (Principles).
١٢ ـ حەوتەوانەی مژدەبەر: مەبەست لەو حەوت کەسانەن بۆ یەکەمجار لەدەوری مامۆستا گردبوونەوەو بیروباوەڕەکەیان بە جیهاندا بڵاوکردەوە. ئەم لە پەنجاکانی ئەم چەرخەدا (١٩٥٠ ـ ١٩٦٠) ڕوویداوە.
١٣ ـ مەبەست لە کامیل ژیرە کە شاعیرو نووسەرێکی کوردە، خاوەنی چەند بەرهەم لێکۆڵینەوەی ئەدەبی‌یە.

# لەم ژمارەیەدا

١٤ ـ کامیل ژیر، شانۆگەریی ئوستاد. دەستنووس.
١٥ ـ (Metaphyisic) وشەکە لاتینی‌یە بە واتای (وراء الطبیعة) دێ، پێچەوانەی ماتریالیستە واتە ماددی.
١٦ ـ مەبەست لەوەیە کە درۆ یەکەمجار لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا دەستی پێکرد وەك دیاردەیەکی سوشیۆلۆجی.
١٧ ـ بەڵگە نەویست: واتە (بدیهیة).
١٨ ـ «عیندەل‌ئیجاب» و «بە دینی پێغەمبەر» لە فریزەلۆجیاکانی ئوستادن.
١٩ ـ ئەم پەندە بەمجۆرەش تۆمارکراوە «هەزار ساڵ بکەی بێگانە پەرستی، ئاخری هەر دەهێنی نوشوستی». لە پەندی پێشینانا زۆرجار جیاوازی‌یە هەیە، بە هەردوو جۆرەکەش دەوترێ‌و بیستراوە.
٢٠ ـ «گەوهەر» لە فەلسەفەدا بەرامبەر بە (Fssencr)، (Substance) دێت بە ئینگلیزی.
٢١ ـ هۆنراوەی شاعیرێکی بەناوبانگی کوردە.
٢٢ ـ گەش‌بینی: بەرامبەر بە (تفاعول) ی عەرەبی بەکارهاتووە. ئەم زاراوەیە یەکەمجار لەلایەن یەکێك لە حەوتەی مژدەبەرەوە کە دوکتۆر عزەت مستەفا رەسووڵە بەکارهاتووە.
٢٣ ـ (Hipocyite) واتە: دووڕوو. لێرەدا زاراوە لاتینیێکە بەکارهاتووە لەبەر سروشتی باسەکە.

●

> دلبەرێ ئیرۆ سەحەر ئاڤهتە جەرگی من دو دوخ
> یەگ لسینە، یەك لدلدا لۆ ژمن تین ئاخ و ئۆخ
> خون ژدل جوجو روان تێ وەك عەقیقی ئەرغەوان بێ
> لێ ژدەست سەلوا جوان بێ، ئەو شەپالا شەنگ و شۆخ
>
> مەلای جەزیری..

# شاری بەدرە لە گەڕووی مێژوودا

لە بیرەوەری ئێمە ماناندا کە ریشەی بۆ کەمتر لە نیو سەدەیەك ئەچێتەوە، شاری بەدرە لە گەڕووی دواکەوتن و بێئاوەدانی و شارستانیدا پەنگی خواردبووەوە لە خانەی بێنازی و کەمترخەمی و نەبووان دابوو وبە ناوچەیەکی سەرسنووری لاکەوتەی دوور لە دیاردەی شارستانی بێئاوی شیرین و بێ دەزگای ڕووناکی دائەنرا.

غفور میرزا کریم

بەناو سەر بە شاری کووت بوو بەلام لە ڕاستیدا پەیوەندیی دانیشتووەکانی تا بلێیت بەم شارەوە بێهێزو کزو لاواز بوو. هەفتەی جارێ ئەگەر پاسە شڕێکی ئەو زەمانە بە ئیشوکاری میری یا بە ئیشی هەمە جۆرەی دانیشتوانەوە لە کووتەوە بەناو تۆزو خۆڵی ئەو دەشتە کاکی بەکاکییەدا بە دوو سێ سەعات ئەوسا بە هەزار زەحمەت ئەگەیشتە بەدرە. ئەمە جگە لەوەی کە هیچ دیاردەیەکی شارستانی و ئاوەدانی یا بازرگانی ئەوتۆ لە کایەدا نەبوو سەرنجی خەڵکی بۆ پەیوەندی بەستن یا بۆ سەردان لەم شارە ڕاکێشێ بە پێچەوانەوە خەڵکی کە باسی ڕێگاو بانی ناخۆش و ئاوە سوێرەکەی شار وەگوزەرانی ناهەمواری دانیشتوانیان ئەبیست ترسیان لێ ئەنیشنت وەهەرگیز بیریان لەوە نەئەکردەوە کە ڕۆژێ لە ڕۆژان سەرێ لەم شارە مێژووییە بدەن. ئیتر هەر ئەم بارە ناهەمواره کارێکی وای کردبوو کە دەزگای میری کۆمەڵانی خەڵکی دژ بە دەوڵەت و فەرمانیەری دڵسۆزی پێ ئەترسان جا ئەگەر کاربەدەستانی میری قینیان لە خوڕەوشتی فەرمانبەرێکی بچوك بێ ئەرخە یا نیشمان پەروەرێکی ناحەز بە دەوڵەت هەڵبسایە چنگ لەسەر شان لە شاری بەدرەی گۆشەگیری سەر سنووری چۆڵ و هۆڵیان تونگ ئەکرد تا سزای میرخاسی و دڵسۆزی خۆیان بکێشن !!.

بەداخەوە چونکە پشکێنەران و زانایان کۆشش و تەقەلای بە پێزو چڕو پڕیان بۆ دەرخستن و ڕوون کردنەوەو ساغ کردنەوەی شوێنەوارە مێژووییەکانی ئەم شارە دێرینە نەداوە بۆیە زۆر ڕاستی و زانین بووە بە ژێر گڵەوە ولە گەرووی نەهێنی مێژوو دا ماوەتەوە چاوەنواڕی کۆشش دوا ڕۆژو چالاکی زاناو ڕۆشنبیرانی عیراقی بەگشتی و کورد بە تایبەتی ئەکا.تا ئەم شارە مێژووییە جێگای تایبەتی و سروشتی لە ڕیزی شارەکانی تردا بگرێ و بکاتەوە.

نوخشەجاری کارو کۆشش پشکێنەران و زانایان بە هەڵکەندن و پشکنینی گردی (عقر) کە دوو کیلۆمتر. لە شاری بەدرەوە دوورە دەست پێ ئەکا کە. وەکو لە ئەنجامی ئیش و کاردا بۆیان دەرکە وتووە کە ئەگەر ئەم مەڵبەندە لە شارەکانی عیراقەوەدوور نەبوایەو کێشەی بێ ئاوی وەناهەمواری ڕێگاو بانی ناخۆشی نەچێشتایە ئەم ناوچەیە لەهەموو ناوچەیەکی تر بۆ هەڵکەندنو بشکنینی وەدەرخستنی مێژوو لەبار ترو باشتر بوو. چونکە جوتیارو باخەوانی ئەم ناوچەیە هەمیشە بەدەم ئیشوکارەوە یا بە هۆی لافاوی باران و گێژەلوکەی بەتینەوە زۆرجار شوێنەواری بایەخداری مێژووییان لە زەوی دا ئەدۆزیەوە. ئیتر کاسەو کەوچکی زۆرو پارچە شکاوی گۆزەو دیزەی و بابەتی گڵکاری تر ئێسکو پروسکی مرۆڤی کۆن لە ژێرگڵی ئەم گردەدا بەزەقی بەرچاو ئەکەوێ کە بێگومان دەولەمەندی و گرنگی ئەم شوێنەوارە مێژووییە بۆ کۆمەلانی خەلکی دەرئەخاو ئەنوێنێ. بناغەی شاری بەدرە لەسەر گردی (عقـر)ی مێژوویی دامەزراوە کە لەسەردەمی سومەری و ئەکدی دا یە ناوی (دیر)وە ناوبراوە. ووشەی (دیر) بە زمانی ئەکدی بە مانای قەلا، یا شار یا جیگای سەختی بەشوراو قولە تەنراو دێ.

کەواتە ناوی بەدرە لە دوو وشەی لێکدراو دارێژراوە. لە ووشەی (بیت)ی ئارامی ووشەی (دیر) پێك هاتووە کە ووشەی (بیت)ی ئارامی بەسەر زمانەوە ئەسوێ و ئەبێتە (بە) وەکو لە بکسایەو بسمایە.. هتد ئەبینرێ ئەم شارانەی کە ئارامیەکان تیایا نیشتەجێ بوون یان سەریان لێداوە وەیا ڕۆیشتون یا پەیوەندیان لە گەلیا بووە. ووشەی بیت یان بە سەردا دابڕیوە. بۆیە بیت و دیر.. لە ئەنجامی ڕۆژگاری دیرین دا بەسەر زمانەوە سواوە وەبووە بە بەدرە. شیاوی باسە لە معجم البلدانی یاقوت حموی دا بەدرە یە تاوی (بادرایا)وە دێ، گردی (عەقر) کە شووینەواری شاری بەدرەی کۆنە گردێکی پان و بەرفراوانە درێژی قەدپالێکی نیو کیلۆ مەترەیە بەرزاییە کەشی ٢٠ مەترە ئەبێ هەر چوار دەوری

بەشواری بەرز تەنراوە کە شوێنەوارەکانی تا ئـەمڕۆش یـەزەقی ئەبیـزیٚ لە تاوەڕاستی گردەکەدا نزماییەك هەیە کە لە ڕۆژهەڵاتی گردەکەوە درێژ ئەبێتەوە بۆ ڕۆژئاوا.. بەمەزنە بریتی یە لە شەقامیك کە لە کاتی خۆی دا ناو شاری بڕیوەو کردویەتی بە دوو بەشی ڕێکەوە. لە ڕۆژهەڵاتی گردەکەوە شوێنەواری دەرگایەك ئەبینریٚ کە بیٚگومان پاشمـاوەی دەرگایـەکی گەورەی شـارە. یەڕاستی بـاو بوران و دەستی سروشت کارێکی وا ناهەمواری بەم گردە کردووە کە گڵی بەسەر بەردەوە نەهێشتووە وینەو ڕوخساری چەندساڵەی بەسەریـەکدا هـەڵشێلاوە بەرزو نزمی شیوو هەڵدێر زۆری تیا دامەزراتدووە لەسـەر قەد پـاڵی گردەکـە گوندێك هەیە کە یەناوی (عەقر) وە لە نزیکیەوە سەرای میری و خـانو بـەرەی نەرمانبەران قووت بۆتەوە بەلاٚم شاری بـەدرەو باخ و بـاخاتی بـەهۆی دۆڵێکی فراوانەوە کە ئاووی گەلاٚلی پیا ئەڕوا گۆزەو دیزەو بابەتی گڵ کاری تر بە زۆری لەناو ئەم گردەدا ئەبیزیٚ کە مێژووی زۆربەی بۆ دوو هەزار ساڵ پیش زایین بگرە هەندێکیان دوورتریش ئەگەڕێتەوە تازەترین گۆزەو دیزەی ئەگەڕێتەوە بۆ دەوری ساسانی ئەمە جگەلەوەی دانیشتوانی بەدرە زۆر جار لەم شوێتەوارە مێژوییەدا بابەتی بایەخ داری کۆن ئەدۆزنەوە لەو بابەتە کۆنەدۆزراواتەی لە مۆزەخانەی بەغدا پاریزراون ئەمانەن:

- خشتێکی نوسراو دەربارەی پاشای کوریکالزو.
- هەندێ مۆری خڕ کە ئەگەڕیتەوە بۆ دەوری پێش مێژوو
- مۆری دەوری ساسانی.
- خشتی دەوری ئەخمینی.
- پارەی دەوری سلوقیەکان

ئەمەو جگە لەزۆر بابەتی بایەخ داری تر کە دانیشتوانی بەدرە بە درێژایی ڕۆژر بەڕێکەوت دۆزیویانەتەوە یا چنگیان کەوتووە بەلاٚم هیچ بایەخو گرنگیەکیان پیٚ ی نەداوە.. هەروا لەدەشت و دەرەوە فریبان داوە بیٚ ئـەوەی هیچ کـەڵك و سودێکی ئەوتۆی لیٚ وەرگرن.

**بیٚگومان ئەو شارانەی کە لەبەرەبەیانی مێژووەوە هاتونەتە سەر شانۆی ژیان لەم سەرزەمینەدا هەریەکەیان پێویستیـەکی تایبـەتمەنـد تانوپۆی چوار دیواری بۆ کێشاوەو بەرگو ڕەنگی دیاری کراوی بەبالاٚدا بڕیوەو وەبە شیوەیەکی خوایەتی دێتە بێش چاو. هەندێکیان بە شارێکی**

**بازرگانی یا ئایینی یا ئیستراتیجی دێته کۆمەڵگەوە وەناو بانگ دەر ئەکاوە یەتە ریزی شارەکانی ترەوە وەقالب و چوارچیوپی سروشتی خۆی وەرئەگرێ.**

شاری بەدرە لە بنەڕەتەوە پێوەیستیەکی تایبەتی ئیستراتیجی وبەرژەوەندی هاو کویی دوو دەوڵەتی جیهانی گەورەی ئەو سەردەمە خواستی مێژوویی ڕیشە تێك ئالاوی سوودو قازانجی دەوڵەتی عیلام و دەوڵەتی بابلی خشتی بناغەو بەردی بۆ کوڵەکەی بنکەی ئەم شارە دێرینە دامەزراند کە لە ئەنجامدا وەکو شارێکی هاوسنووری ئیستراتیجی گرنگ هاتە کایەو سەر شانۆی مەیدانی ئاوەدانی و شارستانی و شوێن و جێگای تایبەتمەندو سروشتی خۆی وەرگرت.

لە ناوچەرگەی ئەو دەشت و دەرە پان و بەرینەی کەئەکەوێتە ڕۆژهەلاتی ڕووباری دیجلەوە کە درێژ ئەبێتەوە بە دامێنی چیای پشتکووە لەلاپەڕەکانی مێژووی کۆن دا لە شاری «کازلو»ی سۆمەری بەولاوە کە ئێستاش شوێنەواری بەدروستی دیاری نەکراوە «هەرچەندە بیروڕای زانایان وایە کە کەوتۆتە ڕۆژهەلاتی ڕووباری دیجلەوە» هیچ شارێکی ئەو تووی گرنگی شایانی باس دانەمەزراوەو نەهاتۆتە سەر شانۆی ئاوەدانی و ژیانەوە. بەدرە بە دووەمین شار پاش شاری «کازلو» ئەژمێرێ کە مرۆڤ توانیویەتی بە شان و بازووی بەهێزی لەم مەڵبەندەدا لە گوێ ڕووباری گەلالی بەدرە بناغەی دابمەزرێنێ وە پشت ئاوی ئەم ڕووبارە لە دەوروبەری شارا بەباخ و باخات و داری میوەدار وەچاندنی کشتوکاڵ ئاوەدان بکاتەوە وەلەدواییدا گەورەیی و گرنگی بە بالای شاردا باداو وەبەرەو پێشکەوتنی هەمیشەیی بیبات.

شاری بەدرە لە سەرە ڕێی وەچەقی دووریانی چیای پشتکوی سەختی بەرزدا هەڵکەوتووە کە تەنها لەم دەربەندەوە بەس کاروان بەرەو کرمتشاەو ئەسفەهان و شارەکانی تری ئێراندا ئەڕۆیشت و ئەهات. بۆیە هەڵکەوتنی شار لەم ناوچەیەدا کە هەتا چاو بڕ بکات بەدەشت و دەری پان و بەرین تەنراوە وەئاوی ڕووباری گەلال یش دەوری بەخشندەی تایبەتی بۆ ئاوەدان کردنەوەو پێکەوەنانی باخ و باخات وەپێگەیاندن و پەروەردەکردنی داری میوەدارو گەشەندن بەکشتوکاڵ و برەو بە مەڕومالات ئەگیراو ئەنواند. ئیتر ئەم هەل ومەرجە گونجاوانە گرنگی ئیستراتیجەتی و مەزنی بری بە بالای شاردا. بۆیە

هەر لەبەرەبەیانی مێژووەوە تەقەلادان بۆ دەستگرتن بەسەر ئەم دەربەندی چیای پشتکو کە سنورێکی سەختی دژواری نێوان دەوڵەتی عیلامو دەوڵەتی بابلیە بە گرنگو گەورە دائەنرا. لە دوایی دا هە رئەم هۆیە سەرەکی یەش بوو کە ناوچەقی ئەم دوو ڕیانەدا بەدرە لە کاروان سەرایەکەوە چووە چوارچێوەی شارێکی مێژوویی گرنگەوە. شیاوی باسە دەشتی کاکی بەکاکی بابلو عیلام لە خاکو زەوی یەکی یەکجۆرلە بوارێکی مێژوویی دیاری کراودا پتیکهاتووەو کەوتوونەتە سەر شانۆی ئەم سەرزەمینە. هەر دوولایان بۆ کشتوکاڵو باخو باخات کردن پشت بەئاووی ڕووبار ئەبەستن لە عیلامیشدا ڕووباری کەرخو کارون یش وەکو دیجلەو فوراتی دەشتی بابل دەوریان لە ئاودێریو ئاوەدانی ناوچەکەدا بینیوەو نواندوە.

بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا لە مێژووەوە پێویستیەکانی ڕۆژگار لە هەردوو دەشتو دەردا دوو نەتەو لەدوایی دا دوو دەزگای دەوڵەتی جیا بەجیای پێك هێناوەو پەیداکردووە خستویەتە سەر شانۆی ژیان. هەروەکو لە مێژوودا سنووری نێوان ئەم دوودە شتە پانویەرینە خۆی لە شێوەی سنورێکی سروشتی سەختدا ئەنواند کە بە ئەهواروزە لکاوی ئاوی دیجلەو کەرخە ڕەنگی کێشرابووکە تا ئەمڕۆش ئەم شوێنەوارەش یەددی ئەکرێ هەرچەتدە خلیجی عەرەبی بەرەو خواریش چووە جا ئەم شوێنەوارانە ئەمڕۆ لە هۆری حەویزەی بەرفراوان وەئەهوارەکانی ئەم بەروو ئەوبەری ڕووباری دیجلەدا بەدیارئەکەوێ بەم چەشنە هەرکاتێ لەشکری دەوڵەتی بابل یا لەشکری دەوڵەتی عیلام کە بیانویستایە پەلاماری یەکتری بدەن وەبچنە سەریەك بەناچاری ڕێگای سەختی چیای پشتکوییات ئەگرت بەر لەبێشدا هەڵیان ئەکوتایە سەر بەدرە وەئەم شارەیان ئەکردە پایگای سەربازییان تا لەوێوە هێرش بەرنە سەر ئەوی تر بەم ڕەنگە شاری بەدرە لەم بوارە مێژوییەدا وەکو شارێکی هاوسنور دووچاری کێشەی مال ویرانو کاولکردن ئەبوو بۆیە ئەم شارە وەکو شارێکی هاوسنوری ئیستراتیجی ناوی دەرکردو ناسرا.

بەڵام لەگەڵ ئەم هەموو بارودۆخە ناهەموارەشدا شاری بەدرە هەربەرەو پێشکەوتنو گەورەییو گرنگی ڕۆیشتووە. وەهەرچەندە کە لە شاری بابلیش دووربووە بەلام پەیوەندی توندوتۆڵی لە ڕووی شارستانیو ئابینی یەوە زۆر بەهێز بووە تەنانەت لە گرنگو مەزنی دا گەیشتبووە ڕادەو پلەیەك ئەوپەرستگای خوایانەی کە لە یەدرەدا هەبوو بابلیەکان بەگشتی ئەیان پەرستگایەکی گەورە

بە ناوی (پەرستگای کوڵەکەی زەوی) تیا بوو کە پاشا. (کوریکالزو) سەرلەنوێ بناغەی دامەزراندبۆوە لەگەڵ پەرستگای تر کە بابلیەکان بۆ پەرستنی خواکان ئەهاتنە ئەم شارە.

جا لەبەرئەوەی هەڵکەندن و پشکنین بەدروستی لە شوێنەواری مێـژویی شاری بەدرەدا بەتەواوی ئەنجام تەدراوە بۆیە بەتەواوی سەرگوزشتەی مێژویی ئەم شارە نازانین ئیتر ئەو زانینە کەمەو گوپچڕ گوپچڕانەی کـە لەم بارەیـە بیستومانەوە هاتونە بەردەستمان سەرچاوەکەی بریتییە لەو زانینەی کـە لە خوێندنەوەی ئەو مێخە بیسماریانەی کە لە «سوس» یان شوێنەوارە مێژوییەکاندا لە عیراقدا لەسەر تاتـەقوڕ یـان بەردی داتـاشراو نـوسراوە. شیـاوی باسـە هەرچەندە لە وولاتی عیلامدا شاری تر کە لەگرنگ و مەزنی دا هیچ کەمتر نیە لە سوس وەکو شاری (ئەوان) کە هەندێ لە پاشاکانی ماوەیەك پاشایەتیان لەسەر وولاتی سۆمەرو ئەکەد دا کـردووە یاوەکـو شاری (انشـان) کە هـەرچەنـدە شوێنەواریشی تا ئێستا دیارینەکراوە بەلام ئەوەندە دەوری گرنگ بووە کە چەند سەدەیەك بارەگای پاشایانی تیا بووە یان و وەکو شاری مەکتو کە تاپیش هاتنی ئەخمینیەکانیش پایتەختی دەولەتی عیلام بووە لەگەڵ بـوونی ئەم شـارانەدا کەچی پشکێنەران و زانایان دەستی هەڵکەندن و پشکنینان هەر تەنها بۆ شاری سوس بردووە کە دوورنیە ئەگەر بکەوتنایە هەڵکەندن و پشکنیني ئەم شارانە زۆر سەرچاوەی مێژویی ترمان ئەهاتە بەردەست کە گرێی نەهێنی زۆرڕاستیمان بۆ کرایەوە. هەروەها لەسەرچاوەی بابلیەکانیشدا دەربارەی شـاری بەدرەو دەوری گرنگی ئەم و باس و خواستانەی خوارەوە دێ، کە بەپێی لیستەی کات و ڕۆژ لە خوارەوە ئەینوسین.

١ ـ سەرجۆنی ئاشوری بە لەشکرێکی گەورەوە هێرش ئەباتە سەر وولاتی عیلام کە لەسەرەتادا شاری «کزلو» لە دوایشدا شاری بەدرە ئەگرێ بەلام پاش کۆچ کردنی ئەم پاشایە ئەم وولاتانەی کە بەزۆر ژێردەستی کردبوون لەوانە شاری بەدرەیە کەبەرپاکردنی شۆڕشێ دژی داگیرکەر هەڵسان کە لەئەنجامدا کوڕی سـەرجۆن نـاچار ئـەبێ هێرشێکی گـەورە بکـاتـە سـەر بـەدرەو وەنـاوچـە شاخاوییەکانی وەسەر لەتوێ بیانخاتەوە ژێردەستی خۆی پاش لەنـاوچوونی ئاشورییەکان بەدرە ئەکەوێتە ژێر دەستەلاتی کوتیەکـان ئەم کـۆتیانـەی کە فەرمانرەواییان بۆ چەند سەدەیەك بەسەر عیراق و ئێراندا لەیەك کاتدا کردووە.

٢ ـ پاشای سـۆمەری «شـولکی» ساڵی ٢٢٠٠ پێش زایـیندا هێرش ئـەباتـە

سەرشاری بەدرە وئەیکا بەپابگایەکی سوپایی تا بتوانێ بەهـۆیەوە پـەلاماری وولاتی عیلام بدات وەسەریان پێ شۆڕ بکات.

٣ ـ ماوەیەك لە دەوری سۆمەرێکاندا شاری بەدرە توانی سەربەخۆیی و ئازادی بۆ خۆی بەدی‌بێنێ. وەپاشای خۆماڵی فەرمـازەوایی بەسـەر ناوچـەکەدا بکـا کەیەکێ لەو پاشایانە پەیکەرێکی داتاشراوی لەبەرد بۆبەجێ هێشتوین کە تیایا نوسراوە ئەم پاشایە پەرستگایەکی و شورەو قـولەی بۆ شـار دروست کردووە وەیەکێ لە پاشاکانی کەناوی (انومتلبك) بو توانی دەستەلاتی خۆی بگەیەنێتە شارەکانی عیلام.

٤ ـ کاشیەکانیش زۆر گرنگیان داوە بە شاری بەدرەو ئەم تاوچەیە ئەگێڕنەوە کەیەکێ لە پاشاکانی کە ناوی کوریکالزو ئەبێ سەرلەنوێ پەرستگای شاری تازە کردەوە وەوەکو ئەڵێن ئەو شوێنەوارەی کە کەوتۆتە خوارووی بەدرەوە کەپێیان ئەوت بکسایا. کاتی خۆی شاربووە یان قەلای کاشیە کان بووە چونکە زانایان وابۆی ئەچن کە ووشەی بکسایا لەبنەرەتدا ناوی بیت کشی بـوە کە بـەسەر زمانەوە سوواوە بووە بەبکسایە.

٥ ـ یەکێ لە پاشاکانی عیلام لە ساڵی ١٢٤٢ ـ ١٢٢٢ پێش زاینیدا هێرشی بردە سەر بەدرە داریان بەسەر بەردەوەنەهێشت پاش ئـەم ڕووداوە بەسـەدەیەك پاشای بابلی شاری بەدرەی کرد بە پایگایەکی سەربازی بۆ هێرش بردنە سەر وولاتی عیلام.

٦ ـ ئاشوریەکانیش لە هیرش بردنیاندا بۆ سەر بـابل و عیـلام کەڵك و سـودی زۆریان لە شاری بەدرەی ئیستراتیجی وەرگرت وەلەم شەڕانەدا ناوچەی بەدرە دووچاری کاول‌کردن و ماڵ‌وێرانیەکی زۆر بوو شیاوی بـاسە لەدەوری ئـاشور بانیپالدا شاری بەدرە کرابوو بە پایگایەکی سەربازی گـرنگ وەئـاشوریـەکان هەرلەم ڕێگەیەوە هێرشیان ئەبردە سەر وولاتی عیـلام کە لەدواییدا کـارێکی وایان کرد کە سوسی پایتەختی عیلامیەکانیان ویران کردو لەگەڵ ئەرزدا تەختی بکەن وەداریان بەسەر بەردەوە نەهێشت.

هەروەها لە سەرچاوەی کلدانیەکان هاتووە کە لە دەروبەری شاری بەدرە بەتایبەتی لە خوارووی شـارەوە ناوی زۆر شـاری کۆنی ئـارامی هاتـووە کە بەتاوبانگ ترینیان (بیت امبی) یەبە کـورتی شاری بـەدرە لە مێژووی کـۆندا

دەورێکی سەربازی‌و ئیستراتیجی گێراوە نواندووە ئاشوری‌و بـابلی‌و عیـلامی
تەنانەت هەرچی دەوڵەتێك کە لەم ناوچەیەدا هاتۆتەکایەوە کەویستوویەتی بچێتە
سەر دراوسێکانی بەمەبەستی داگیرکردن، ناوچەی بەدرەی ئیستای کردووە بە
پایگای سەربازی خۆی بویە بەشێ لە مێژوودا هەرکاول کردن‌و وێرانی‌و دواکەوتن
بووە هەر لەبەر ئەم هۆیە ئیستـراتیجیەتـە ئەم شـارە وەلە دەوری میرنشینی
بەبەش‌دا میرەکانی بەبە هەمیشە ویستویانە سنووری میرنشینەکەیان بگەیەنبنە
ئەم ناوچەی کوردوستانە بـۆیە لە ڕۆژانی دوو بـەهاری وتـاق پەرەسـەندن‌و
گەورەیبان‌داو هەڕەتی دەستەلاتداری بەرفراوانیان زرباتیەو بەدرەوجەسانیش
ئەکەوێتە ژێر سێبەری فەرمانڕەوایی ئەم میرنشینەوە.

---

تێبینی:

---

زۆر سودم لە نوسینی بەناوی (بدره تأريخها واهميتها الأثرية) کە فؤاد سفر
لە گۆڤاری سۆمەری الجزء الأول ساڵی ١٩٥١ نوسیویەتی‌و وەرگرتووە.

گەلاڵ.. بەچەمێك دەلێن باوبوران‌و بـەفر بـەدرێژایی ڕۆژگـار دروستی
کردووە واتە دەستکردی سروشتە دیارە گەلال ووشەیەکی کۆنی کوردی‌یە بـە
بادینانی وەکو لە کتێبەکەی وەرگێرانی دبلوماسی.. کە سەریزصـلاح سعد الله
داهاتووە پێی دەڵێن جەلال.

وەرگێڕانی ـ نجاة حمید احمد

## شیعری یەکەم

جۆرج دوهامێل ئەم شیعرەی لە ساڵانی ١٩١٤ ـ ١٩١٨ نووسیوەتەوە، لەم سەردەمەش فەرەنسا هەر وەك زۆر دەوڵەتی تر کەوتە ژێر هێرشی نازی یەکانەوە، لە شیعرەکەدا وەك دە بینین دوهامێل باسی نازی یەکان ناکات بەڵکوو هەر وەك شاعیرێك دەیەوێت سنووری سۆزو چاو نەترسی و بە وەفایی دایکمان نیشان بدات، گرنگی شیعرەکەش هەر لە ڕووانینە هەڵوێست دارەکەی دایکەوەیە بەرامبەر کوڕە بریندارەکەی؛ لە هەمان کاتیشدا دەیەوێ ئەم دایکە نموونەیی یە لە ئافرەتێکی لا دێیی یەوە بنوێنێت.

## بالادی فلۆرەنتای باخەوان

بیست ڕۆژی دوورو درێژ گیانی نەدایە دەستەوە
دایکیشی بە تەنیشتی یەوە.
فلۆرەنتای باخەوان بەرگری ی لە مردن دەکرد،
چونکە دایکی نەیدەویست سەر بنێتەوە.
هەر لەو ساوەی کە زانی ی کوڕە ی بریندارە،
لە دوورترین لای وولاتەوە، کەوتە ڕێ.
نیشتیمانی پڕ لە گرمەی دایە ژێر پێ
کە لە نێو قوڕدا سوپای گەورە هاژەی بوو.
ـ دەمو چاوی لە ژێر فوتەی توند پێچراوا پەشۆکا بوو؛

نه لەکەس و نه لە هیچ شتێك ترس نەبوو.
سەبەتەیەکو دووازدە سێوو،
قاپێك کەرەی تازەی هەڵگرتبوو.
بە درێژایی گشت ڕۆژگار
بە پاڵ جێیەوە دانیشتبوو کە
فلۆرەنتا لە سەریا گیانی دەدا.
کاتێ گەیشتە ئەوێ، ئەوان ئاگریان دەکردەوە
تا ئەو ساتەی فلۆرەنتا بە بێ هۆش دەدوا
لەوێ یا نە دەجوولایەوە.
کە دەستیشیان بە پێچینەوەی سنگی زامداری دەکرد
پێیان دەووت: «بڕۆ دەرێ !». تۆزێ دوور دەکەوتەوە
گەر پیووایە لەوێ دەمایەوە:
بەڵێ ئەو دەتوانێت برینی کوڕەکەی ببینێ.
ئەی لە چاوەڕوانی‌یا کە پێڵاوەکانی لە ئاو هەڵکێشراون
نابێ گوێی لە هاواری کوڕەکەی بێ ؟
وەك سەگێ بە وەفا بە دیار جێگاکەوە بوو،
نە نانی پێ دەخوراو نەئاو.
فلۆرەنتاش ئەوا چیتر نەیدەزانی چۆن نان بخوا:
کەرەی نێو قاپەکەی زەرد هەڵگەڕابوو.
دەستی لاوازی کوڕەکەی خستبووە
نێو دەستی لە رزۆکی‌یەوە وەك ڕەگی دار.
بە چەسپی دەیڕووانی‌یە دەمو چاوی
سپی هەلگەراوی کوڕەکەی، کە ئارەقەی لێ دەچۆڕا.
دەیڕوانی‌یە ملی پێچراوی‌یەوە
کە هەر هەناسەی دەدا، خوڕەیەکی لێوە دەهات.
هەموو ئەمانەی بە چاوێکی پڕ لە گرەوە دەبینی،
بە چاوی کزوو ووشکی، وەك شەقاری سەر تاوێر.

کوڕە دەیوت: «ئەوا دیسان کۆکە هێزی بردم.»
ئەویش وەڵامی دەدایەوە: «ئەی نازانیٚ من لێرەم !».
دەپوت: «وابزانم تۆزێ تر کۆچ دەکەم.»
بەڵام دایکە دەیوت: «نەخێر کوڕی خۆم من نامەوی !»
بیست ڕۆژی دوورو درێژ گیانی نەدایە دەستەوە،
دایکیشی بە تەنیشتی‌یەوە.
هەر وەك مەلەوان بازێکی چاك لە نێو دەریایا
کوڕە لاوازەکەی بە خۆیەوە بگرێ.
بەم بارە، بەیانیانێك، کە زۆر ماندوو بوو
دووای بیست شەو کە نەدەزانرا لە کوێ بردیە سەر،
تۆزێك سەری نایەوەو چاوەکانی خەو بردیانی‌یەوە؛
ئەو سا فلۆرەنتا دەست بە جێ، بە خامۆشی
گیانی دایە دەستەوە
نەوەك دایکی لە خەو هەڵسێنێ.

●

## شیعری دووەم

ئـەم شیعرە هی شـاعیرێکی یـۆنانی‌یـە. یۆنـانی سەردەمی بـەرگـری کـردن لە نازی‌یەکان‌و یۆنانی سەردەمی شـەڕی ناوخـۆ، شاعیـری بەرز بـەرزی پێ‌گەیـاند. دەتوانین ئەم شاعیرانە بکەین بە دوو دەستەوە، دەستەیەکیان ئەو شاعیرانەن کـە خاوەنی ناوو ناو بانگێکی گەورە بوون‌و شیعرەکانیان بە سەر لاپەڕەکـانی گۆڤـارو ڕۆژنامەی زۆرترین لای جیهانەوە بوون، شیعـری ئەم شـاعیرانـە زۆر نەژیـان‌و لە بیرکران. دەستەی دووەمیشیان ئەو شاعیرانەن کە شیعرەکانیان بوونە سروودی سەر زاری میللەت‌و خەڵکی دەیان کردن بە گۆرانی بێ ئەوەی ناوی نووسـەرەکانیشیـان بزانن. ئەم شیعرانە بـۆ سەر هیـچ زمانێـك وەر نەگێـڕدراون، بەڵکـوو هەر لە نێـو میللەتەکەیاندا گەیشتوونە بەو ترۆپکە سەرکەشەی کە هەموو شاعیرانی دنیا خەوی پێوە دەبینن.

پابا داک

## دووا نامە

دایكو بابو براکانم سلاوتان لێ بێ.
تۆش دایەگیان با فرمێسکت نەڕژێ.
من لە پنیاوی تێکۆشانی گەلا بێ دوودڵی سەر دەنێمەوە
کاتێ بە شادومانی زەنگی سەربەستی لێ دەدرێ،
بڵێن لە نێو «قووربانییەکانی تردا» سوٚتوٚش
هاوبەشی زرینگەی ئەو زەنگەیە.
برا بەشەرەفەکانم ئێوە دەبێ توٚڵەی من بسەنن
تاکوو مردن هێزم لە شوێنی خوٚیا نەڕووشێنێ
کە مردم هەرسێکتان دەبێ لە شوێنی مندا بن لە سەر پێ
بوٚ هەر ئازارێکت کە من بوومە هوٚیان
لێم ببوورە دایکی خوٚم
بوٚ ئەم ئازارانەش کە ئێستا بەری شانت دەگرێ
دەبێ دژی کوٚیلەیی تەنها بەقین بگوٚڕێ
پێش مردنم
دایكو بابو براکانم سلاوتان لێ بێ.

## سەرچاوە کان

(1) G. MAUGER — LANGUEET CIVILISATION FRANCAISE — PARIS — PAG — 148.

(2) PIERRE,BAM BOTTE, LA POESIE EST DANS L'HISTOLRE.

●

روونکردنەوەك

خوێنەری بەڕێز

ئەو نموونە شیعری یانەی لەم وتارەدا هاتوون هەر لایەنەری یەکە وەرگیراوەو مەبەستی من لە هێنانیان کە چۆن کەلەپوور لەم شیعرانەدا بەکار هاتووە و هیچ پەیوەندی یەك بە بیرو هەڵوێستی سیاسی خاوەنەکانیانەوە نی یە.

د. نافع

# کەلەپوور
# لە شیعری کوردی
# هاوچەرخدا

«رسولی هەمزاتۆف» لە کتێبەکەی «داغستانەکەم» دا دەڵێت:ـ

«هوزانڤانەکان شیعر دەنووسنەوە بۆ ئەوەی قووڵترین گیرو گرفتی دەروونو چەرخو گیانو رۆحو مێژووی خۆیان بگێرنەوە... هەروەها نیڤشکی بیرو هەستەکانی خۆیان بێتە بەرچاو و ئاشکراکەن...» تا دەڵێت: «شاعیرانی وڵاتەکانی دوورو نێزیك لە هەموو چەرخەکاندا لە گەڵ خۆیاندا ئاسمانو خاكو خۆلی ئەسپانیاو ئاوازو رەنگەکانی ئیتالیاو نوێژو قوربانیەکانی هیندوستانو راستیو جوانی فرەنسایان بو گوندە خنجیلانەکەی من هێناوەو دێنن».[1]

دەقی ئەو وتارەی لە وەرزی روشەنبیری کولێجی پەروەردەی زانکۆی سەلاحوالدین پێشکەش کرا

د. شەوقی ضیف دەڵێت: «مانەوەی شیعرو نەمری یەکەی لە کۆنترین چەرخەکانی ژیانی مرۆڤەوە تا ئیمڕۆ شتێکی سروشتی یەو ئەم دیاردەیە تایبەتی نی یە تەنها بە شیعرێك یا میللەتەکەوە چ ڕۆژهەڵات بێ یاڕۆژئاڤا... چونکە شیعر ئاخاوتن لە گەڵ شتێکی نەگۆڕاوی خەڵك دەکا... ئەو ژی غەریزەو فیترە نەمرەی مرۆڤایەتی یە کە هەرگیز ناگۆڕیت وپەرەناستێنێو نابێتەشتی تر بەڵکو هەر نەگۆڕاوە لە لای هەموو خەلکی جیهان ئەوەی لە لای هەر مرۆڤێك و لە قووڵایی دەروونی دا هیواو ئومێدو غەرائیزو هەستەکانی هەموو وەکو یەکن... ئەگەر هەر کەسێك ئیلیازە بخوێنتەوە هەر وەك لە کۆنەوە دەیانخوێندەوە لە هەموو کات و چەرخێك دا نەوەك خوێندنەوەی وێنەگرتنی جەنگی یونان و تەرواددیە کە «هۆمیرۆس»ی یۆنانی هۆنیویەتی یەوە بەڵکو وەك مەسەلەیەکی هەمیشەی و نەمر کە تەمسیلی هەموو کێشەو جەنگەو ململانیەکی تێدا دەخوێنتەوە نە تەنها لە نێوان دوو شاردا بەڵکو لە نێوان دوو میللەت و هەموو میللەتاندا... هەر یەهەمان هەڵچوون و کارتێکردنی و هەست دا شیعرەکانی «المتنبي» دەخوێنینەوە کە جەنگەکانی عارەب و ڕۆم وێنە دەگریت و دێنێتە بەرچاو کە لە کاتی حوکمرانی «سیف الدولە»دا روویاندا وە.[٢]

ئاشکرایە لەم هەر دوو ئاخوتنانە کە شیعر چەندو بەهایەکانی دەگەنەچێ لوتکەیەك وەك پێویستی یەکی ڕۆحی و هەمیشەیی مرۆڤە لە هەموو چاخ و کات و زەمانەکدا.

ئەوی شیاوی باسە کە شاعیری ئیمڕۆمان بیروو هەست وڕێبازی تایبەتی خۆی هەیەو لە سەری دەڕوات و یەکەك لەم ڕێبازانە سوود وەرگرتنە لە کەلەپوور بە هەموو جورەکانی یەوە.. دیسان ئێمە شاعیری ئیمڕۆمان بە شاعیری هاوچەرخ دەناسین و بە یەکەك لەوانەی بە شداریان لە شۆڕشی مەزنی نوێبوونی شیعریان کردووە دەزانین بەلام لە پێش هەموو شتێك بزانین واتاو مانای پەیڤی هاوچەرخ و شیعری هاوچەرخ و هاوچەرخی لە شیعردا چێ دەگەینێ پاشان هەول دەدەین بزانین پەیوەندی ئەم شیعرە هاوچەرخی بە کەلەپورەوە چی یە..؟

بە پرسیارێك دەست پێ دەکەین و دەڵێن: ئایا هاوچەرخی ئەوەی دەگەینێ کە شاعیر باسی چاخی خۆی بکات...؟

خۆ هەر وایە... هەر هوزانڤانەك باسی دەمو چاخ و كاتی خۆی دەكات.. چونكە نابێ هوزانڤانەك لە وەختێك‌دا بژیت و دەربڕین و تەعبیر لە چاخێكی تر بكات... ئەگەر هەبیت ژی كەمە.. بەڵام تەعبیرو دەربڕین لە ئایندە مافێكی راستی شاعیرە.

«د. زەكی نەجیب محمود» وەها ئاشكرا دەكا كە واتای هاوچەرخی لە شیعردا ئەوەیە كە مەسەلەكە بناغەی نوێ بوونەوەی شیعر بێ وا هەروەها دەڵێت.. **«هەموو شاعیرانی ئیمڕۆمان هاوچەرخن چونكە زادەی ئەم چەرخەن».**[٣]

هیندەك جار هەر وەك گوتم شاعیر هەیە زادەی ئەم چەرخەیەو لە چەرخەكانی ڕابردوو دەردەبڕێت.. هەر چەند كەم ژی‌ین.. كە چی ئاخوتنی «د. زكی نجیب محمود» ناكرێت بە یاسایەك كە هەر كەسی لەم چەرخەدا بژێت لە شاعیران، ئەبێ بە هوزانڤانی هاوچەرخ و شیعرەكەی بە هاوچەرخی بناسرێت... هەر وەها نابێ ئەوە ژی لە بیربكەین كە هەر شاعیرەك لە لای خۆیەوە وا بیردەكاتەوە كە زادەی چاخ و دەمی خۆیە... هەر وەها وا بیردەكاتەوە كە تەمسیلی ئەم چەرخە دەكات.. كە چی ئەوەی راستی بێ... بیری هەر هوزانڤانەك لەم بارەیەدا تا ئەوو راددەیە راستە كە تا چێ سنورێك ئەم شاعیرە لە گەڵ چەرخ و كاتی خۆی‌دا گونجاوەو لە ڕۆح و گیانی ئەم چەرخە تێگەیشتوە.

لەم ڕوانگەوە دوو جۆری هاوچەرخی‌یەتی لە شیعری ئێمەدا بە دی دەكرێن.. ئەم دوو جۆرە ژی لە راستی‌دا دوورن لە واتەو مانای هاو ـ چەرخی راستەقینە.

جۆری یەكەم ئەو كەسەن كە بە تێڕوانینەكی سەرەكی تەماشای مانای هاوچەرخی دەكەن... بۆ نموونە باسی ێنەگرتنی موختەرەعات و دەسكەوتووە-كانی زانستی ئەم چەرخەدەكەن و وادەزانن ئەم شتە هاوچەرخی‌یە..!! كەچی ئەم جۆرە لە سەر هامیش و كناری چەرخدا دەژین.

جۆری دووەم ئەو كەسەن كە داوای هاوچی‌رخی موتلەق دەكەن و خۆیان لە كەلەپوور دەشۆنەوە... ئەمە ژی هەر وەك دیارە هیچ هەست بە رابردوو نەكردنەو شیعرەكەش هەر لە بازنەی ئامێرو پیشەسازی و داب و نەریتی سایكۆلۆژی و نەخوشی‌یەكانی دەروونی چەرخ دەسووڕێتەوە كە چی ئەم جۆرە ژی نەیتوانی تا دوماهی بەم ڕێگایەدا بڕوات و دووبارە گەڕاوە بۆ رەوشت و نەریتی كومەل و كەلەپووری میللەتەكەیەوە.

بەچاکی دیارە کە نوێ خوازیو هـاوچەرخی لە شیعـردا ئەوە نی‌یـەکە شەمەندەفرو تەیارەو موشەكو ئاسمان بە خەڵك بنـاسێنینو شیعر لە سـەری بنووسرێت... هەر چەندە ئەگەر بکرێت ژی هەولێکی گەلێـك سادەیـە لە سەر رێبازی نوێ خوازیو هاوچەرخی‌دا، چونکە دیارەئەگەر شاعیرێك باسی هێسترو کاروانو کوچەریو ژی بکات ئەتوانێت هەولی ئەم هوزانقانـە پر بێت لە رۆحو گیانی نوێ خوازیو هاوچە رخی، لێرەدا ئەتوانم بڵێم کە گرینگ نی‌یە دەسکەوتو شەواهیدی چەرخ ببینین، کەچی ئەوی گـرینگە چـۆن ئێمە رۆحو گیـانی ئەم چەرخە تێگەهینو تەعبیری لێ بکەین.

## «مومەیزاتو تایبەتی‌یەکانی هاوچەرخی‌یەتی:

ئەتوانم تایبەتی‌یەکانی هاوچەرخی یەتی وەك بناغـەیەکی مـەسەلەکـە ئاشکراکەم:

١ ـ شیعری هاوچەرخ تاقی‌کرونەوەی ستاتێکی خۆی هەیە لە جووڵانەوەی نوێ خوازی شیعرەکەدا، هەر لە بـەر ئەوە فـەلسەفـەی ستاتیکی ئـەم شیعرە لە فەلسەفەی کۆن جیاوازە لە بەر ئەوەی فەلسەفەکەی شیعری نوێ لە کانگای سروشتی کارە هونەری‌یەکە خۆی هەڵدەقووڵێت نە وەك. مەسەلەکە لە مەبادئو یاسایەکانی دەرەوەکە بە زۆری لە سەری‌دا چەسپێنرابن دەربچێت.. هەروەسا ژی ئەتوانم بڵێم شیعری هاوچەرخ ستاتیكو جەمالیاتی تایبەتی خۆی بو خۆی دروست دەکا چێ فورم یا ناوەرۆك، ئەمە ژی هەر وەك دیارە دەگەڕێتەوە بـۆ هەستو بارو زرووفـو تامو چێژی چەرخەکە.

٢ ـ شاعیری نوێ پەیوەندی‌یەکی پتەوی لە گەل رووداو مەسەلەکانی چەرخی خوی‌هەیەو وەك تەماشەگەرێك نی‌یە بەرامبەر ئەم شتانە کـە وێنەیـان بگرێت بەڵکو لە ناو جەرگی ئەم رووداوانەدا دەژێتو خـۆی بە خـاوەنی مەسـەلەکە دەزانێت.

٣ ـ ڕۆشنبیری چەرخ بە هەموو لقلقینەکانی‌یەوە لە ناو شیعری هـاوچەرخ‌دا رەنگدەداتەوە، یەکەك لە مەرجەکانی گرینگی بـوون بە شـاعیری هـاوچەرخ ئەوەیە کە ئەبێ بیرو هەستی بە چاکی رۆشن بێت بە فرەهترین واتای وشـەی ڕۆشنبیری چەرخ، چونکە شیعری هاوچەرخ هەولە بۆ لەئامێز گرتنی ڕۆشنبیری مرۆڤایەتی هەمووی ئەمە ژی شتێکی روونو ئاشکرایە کە هەولی نوێ‌خوازی

شیعریمان له کاتێکدا له دایك بو که هەڵچوونی بیریو رامیاری له لووتکه دا بوو هەر بەرەو بەرزی دەروات.

٤ ـ له لای هەموومان ئاشکرایه که شیعر.. هەر شیعرێك کۆن یان ژی نوێ دەبڕینو تەعبیره له تاقیکردنەوەیەکی حیسیو هەستی تایبەتی، که چی شیعری هاوچەرخ زیاتر له تاقیکردنەوەی خۆیاتیو زاتی شاعیر هەستو ژانەکانی کومەڵیش له ئامێزدا دەگریتەوەو وەك تاقیکردنەوەی دەروونی شاعیر و هەموو لایەکی کومەڵ پێکەوه لەدایك دەبێت... هەر لەبەر ئەوه ژی ئەتوانم بڵێم که بەهاو قیمەتو تاقیکردنەوەکانی کومەڵایەتی له ناو شیعری هاوچەرخیماندا هەنو... وەك پوختو نیوشکی تاقیکردنەکانی مرۆڤی هاوچەرخو میراتی نەوەکانی رابردو و نهوی ئەم مرۆڤەنه.
٥ ـ شاعیری نوێمان که لەم چەرخەدا دەژێت هەوڵ ئەدا مێژووی مرۆڤ تێبگاو ئیستیعابی بکا به چاوو تیڕوانینەکی چەرخو کاتی نهوی ئیمەو... بەم ریبازەدا سوود له تاقیکردنەوەکانی کۆنو خیبراتی مێژوویی وەربگرێت بو ئەوەی بەهاو مەفاهیمی نوێ دروست بکات.
وەسا هاتۆته پێش چاڤ که هەر مەسەلەی مرۆڤەو له هەر جێگایەك یان له هەر کاتێكدا به مەسەلەی خۆی ومەسەلەی هەموو مرۆڤو مرۆڤایەتی دەناسێتو مامەڵەی لەگەڵدا دەکات.

٦ ـ شیعری نوێو هاوچەرخی ئیمه پەیوەندیی له گەل چوارچێوەی شارستانییەتی گشتی چەرخی ئیمەوه هەیەو هوزانڤانمان له بازنەی ئەم مەسەلەدا دەرناچێت، هەر وەك شارستانییەتی مەسەلەیەکی گشتی بێتو بو هەموو کەسێك وەك یەك بێت له سەر هەموو ئاستەکانیدا چێ ڕوشنبیری باد کومەڵایەتیو رامیاریو... هتد. واته هەموو لایەکانی شارستانییەت هەستو دەروونی شاعیری ئیمڕۆمان بۆ خۆی رادەکێشێ تا هەوڵ بدات تاقیکردنەوەکانی شەخسیی خۆی لەگەل مەسەله مەزنەکانی مرۆڤ تێکەڵكاتو هەویرکاتەوەو پاشان شیعری نوێو هاوچەرخ لەم شتە لەدایك دەبێت. له بەر ئەم مەسەلانەو... هەر وەك دیاره ژی که شیعری نوێمان له «گۆران» ی مەزنەوه دەست پێدەکات تا نهوی ئیمه به شیعری هاوچەرخ له قەلەم دەدەین چونکه تەعبیر لەم چەرخه دەکاتو له سەر هەموو تیۆری و تیڕوانینو سنوورەکانی شارستانییەتی ئیمڕۆمان هەر وەها به چاکی ژی ئاشکرایه که شاعیرو شیعری هاوچەرخمان هیچ دەمێك خۆی له کاتو چەرخەکانی کۆنو رابردوو به هەموو

لایەکانی کەلەپووروەوە دوور نەکردۆتەوە هەر وەها خۆی بەم کۆن و نهۆیەدا ئابلۆقە نەداوە بەڵکو بیری لە ئایندەش کردۆتەوە ڕێگا نەخشەکێشانی پاشەرۆژیش دەکێشێ.

هەر لەم روانگەیەوە ئاشکرایە شاعیری هاوچەرخمان بە هەموو واتاو مانای هاوچەرخی نهو، خۆی لە رابردوو و ئایندەی نەبڕیوە.. وەك نموونە تەئکیدی لەسەر پەیوەندی نهو بە رابوردوو یان ژی واقیع بە مێژوو دەکات... چونکە بە چاکی دیارە کە ئەو هاوچەرخی‌یەی لە رەگو ریشەی خۆی دوو دەکاتەوە وەك پارچە کاغەزێکە لە سەر زەوی لە کاتی باو باروڤەو زریاندا.

## کەلەپوورو شیعری هاوچەرخ:-

لێرەدا هاوچەرخی‌یەتی شیعرو هوزانڤانی ئێمە بە هەموو واتاو مانای ها وچەرخی هاتە بەر چاڤ... بەڵام مەبەستمان لێرەدا ئاشکراکردنی دەورو پەیوەندیی کەلەپوورە بەم شیعرە هاوچەرخی‌یە... چونکە وەك دیاربوو، شیعری هاوچەرخمان رەگو ریشەی لە کەلەپووری مەزن و دەولەمەندی مروڤایەتی هەڵدەقولێت و دەردەچێت و مەزن دەبێت و نەمەردەبێت.

ئەوی شیاوی باسە پەیوەندیی کەلەپوور بەشیعری هاوچەرخ پەیوەندی‌یەکی جەدەلی‌یە، لەبەر ئەوەی شاعیری هاوچەرخمان کەلەپوور بە سەرچاوەیەکی پر سامان و دەڵەمەند دادەنێت کە چی هەمووی وەرناگرێت و هەر وەها هەمووی ژی رەفزناکات... لێرەدا ئەتوانم بڵێم کە لە نێوانیاندا پەیوەندی و تێکهەڵبوونێکی تەواووکارتێکردن و تەفاعول هەیەو شاعیرمان بە چاوی چەرخ ودەمو کاتی ئێمە وەتەماشای ئەم کەلەپوورەمەزنەدەکات.. هەروەها دیسان ئاشکرایە کە هەڵوێستی شیعری هاوچە رخمان لە گەڵ کەلەپووردا وەك مەسەلەیەکی **کاتی‌یە**، لەبەر ئەوەی رەنگدانەوەی پەیوەندیی شیعروکەلەپوور وەك مەسەلەی کاتە و موعادەلەیەکی دوو لایەنی هەیە شیعری ئیمرو لە گەل رابردوو هەروەها لە گەڵ هیواوهیڤی و ئومێدی ئایندەوشیعری هاوچەرخ رابردوو ← نهو ← ئاینده

هەرلە بەر ئەم مەسەلەیە تێکهەڵبوون وکارێکردن و تەفاعولی ئەم سێ ئاستە لە ناو شیعردا لەگەل هەست و تاقی کردنەوەی زاتی هوزانڤانی و خیبراتی

دەوروبەرو ئەو جیهانەی شاعیرتیّیدا دەژیّت... هەموو ئەم لایانە لەگەڵ یەکدا هاوبەش دەبن لە دروستکردنی پەیکەری پیرۆزی شیعری ئیمڕوماندا بەلاّم لە بەر ئەوەی پەیوەندی ی شیعرو کەلەپوور بە چاکی بیّتە بە رچاوئەبیّ ئەم نوقتانە لە بەر چاوبن:ـ

١ ـ ریّز لیّگرتنی شیعروشاعیری هاوچەرخمان بوکەلەپوور نابیّ وەها دیار ببیّت کە هەڵگرتنی کەلەپوور بیّ یان ئیّمە بار بین بە سەر کەلەپوور واتە نە ئیّمە کەلەپوور لە سەر کوّڵمانەوە هەڵگرین و نە بینە سەنگیّنی ژی بە کوّڵی کەلەپوورەوە، بەڵکو ئەبیّ کارتیّکردن و تەفاعول لە گەڵ کەلەپوردا بکریّت وەك گیان لەبەریّکی سەربەخوّ.

٢ ـ ئەبی لە روانگەی زانستەکانی هاوچەرخی یەوەلە کەلەپوورمان بکوّڵینەوەو بپشکنین و ئەم کارە ژی نابیّت بو کە مکردنی بەهایەکەی یان پیّ هەڵگوتنی کەلەپووربیّت بەڵکوبوّ دیارکردنی بەهایەکانی نەمری ئەم کەلەپوورەبیّت.

٣ ـ ئەبیّ بەریّبازی هاوچەرخی هەڵویّستی روّحی و پەرەسەندن و جوانکاری و نەمری کەلەپوور هەڵسەنگیّنین و هەر بەم ریّبازە سوودی لیّوەرگرین.

٤ ـ ئەبیّ شاعیر جوّریّکی هاوسەنگی لە نیّوان رەگ و ریشەی مروّڤ لە رابردوو لە گەڵ لق و پوپەکانی نهوو میّوەی ئایندەدا دروست بکات تا مەسەلەکە بە ویّنەیەکی ستاتیّکی و جوانکاری بیّتە بەر چاو.

•

## چیّ شوڕشیّك:ـ

وەك ئاشکراو دیارە لە نووسینەکانی رەخنەگرو میّژوونوسانی ئەدەبی کوردی وجیهانیش کە شوّڕشیّك لە شیعری هاوچەرخدا... بەرپابووە ئەم شوّڕشە بو نەهیّشتن بەزینی سنورو فوّرمەکانی کلاسیکی بوونە وەك بوّ پەڵخاندن و نەهیّشتنی کەلەپوور... بوّ ئەوە بوو کە شیعرمان لە چارچیّوەو سنورو فوّرمەکانی بەستی و بیّ پەرەسەندن و نەگوڕاودا دەربچیّت و ئەم پەرژینانە نویّ بیّتە بەر چاف... دیسان ئیّمە چاك دەزانین کە فوّرمی کلاسیکی روّحی کەلەپوور نی یەو ئەو شتە نەمرەی کەلەپووردا بەهایەکانی روّحی شاردراوەن لە ناوی‌دا واتە «بەهایەکانی مەعنەوی»، هەر چەندە شیعری ئیمروّمان لە فوّرم قاڵبەکانی کوّن یاخی‌بووە بەلاّم پەیوەندی ی نهوی شیعر لە گەل کەلەپوردا گەلیّك پڕ سوزو

# وته‌ی ژماره

دۆست و دڵدارانی وشه‌ی گه‌ش و پاك و ره‌سه‌نی کوردی خواستی رووناك و بالآیان سه‌ر له نوێ له گۆڤاری نووسه‌ری کوردی ژماره دوودا به‌رچاو ئه‌که‌وێ .. چونکه ئه‌م گۆڤاره هه‌میشه ده‌نگی به‌رزی راستی و جوانخوازی نووسه‌ر و رۆشنبیرانی گه‌لی کورد بووه و ده‌ربڕی هیوا و مه‌به‌سته ره‌واکانیان بووه و به‌و نیازه‌ی که له سه‌ر زه‌مینه‌یه‌کی پێشکه‌وتووی پته‌وی پشت به‌ستووبه ئه‌و هه‌سته پیرۆزانه‌وه که خۆشه‌ویستی گه‌ل و نیشتمان ره‌نگیان تێدا ئه‌ده‌نه‌وه به شانازی‌یه‌وه لاپه‌ره بێ گه‌رده‌کانی بۆ هه‌موو خامه‌یه‌کی توانا دارو به‌شه‌ره‌ف ته‌رخان کردووه که وه‌ك پرشنگ وشه گزنگداره‌کانیان له‌سه‌ر دێڕه‌کانی بهۆنته‌وه‌و به یه‌کیانه‌وه ببه‌ستن.

بێ گومان ئه‌رکی پێشکه‌وتنی ئه‌م گۆڤاره‌و به‌هێزکردنی نه‌ك هه‌ر ته‌نیا له ئه‌ستۆی ده‌سته‌یه‌ك رۆشنبیرو نووسه‌رو هونه‌رمه‌ندی کورددایه. بگره کاره‌که وایه که ئه‌که‌وێته ئه‌ستۆی هه‌موویه‌کی له‌و کوردانه‌ی که خۆیان به لێهاتوو ئه‌زانن و بۆ نووسین و شیعرو چیرۆك به خۆیاندا رائه‌په‌رمون.. که‌واته هه‌موو که‌موکورتی‌یه‌ك که له گۆڤاره‌که‌دا .. له رووی به‌رز نه‌بوونه‌ی پله‌ی ئه‌م گوڤاره‌وه روو بدات له ئه‌ستۆی هه‌موواندایه.

ئه‌م گۆڤاره.. نووسه‌ری کورد.. که گۆڤاری وێژه‌وانانی گه‌لی کورده.. خۆی زۆر به به‌ختیار دائه‌نێ که به بۆنه‌ی جه‌ژنه کانی ته موزی پیرۆزه وه،پیرۆزبایی له گه‌لی عراقی خۆشه‌ویست بکات و گه‌لی کاری گه‌وره‌و به‌هره‌مه‌ندانه ئه‌گرێته ئه‌ستۆی خۆی و رایان ئه‌په‌ڕێنێ. که یه‌کی له‌وانه.. به‌ستنی کۆڕی شیعری

کاراتره، هەر لە بەر ئەوەی کە سۆزی ئێمە بۆ کەلەپوور ئەوە نی یە کە بە دوای دا بکەوین، یان بە شوێن پێ ی دا بڕوین یان لە گەڵی دا وەك هێڵێکی موازی بچین، نە بەڵکو ئەبێ لەرامبەری راوەستین و تێبگەهین و ئیستیعابی بکەین و لێی بکۆڵین ـ ـنەوەو ئاشکراکەین بە تێڕوانینەکی هاوچەرخ کە ئەم کەلەپوورە چەند واتاو مانایەکی مرۆڤایەتی و مێژوویی تێدان و پاشان سوود لەم ماناو بەهایانە وەرگرین... بە چاکی ئاشکرایە کە شاعیری ئیمڕۆمان هەلوێستە نەمرەکانی خۆی لەم کەلەپوورە مەزنەدا دەردێنێ چی لە لای مێژوو یان بەلای مرۆڤایەتی یەوە یان بە هەردوو لایەوە.

### کەلەپوور چی یە..؟!

کەلەپوور ئەو پاشماوەو میرات و خیبرەو تاقی کردنەوەکانی مرۆڤی رابردوون کە بۆمان ماونەتەوە لە دەسکەوتوەکانی ئەدەبی و زانستی و هونەری رامیاری و.. هتد.. لە سەرەتای کۆنترین چەرخەکانی مێژوو تا گەیشتنی مرۆڤی هاوچەرخمان بە لووتکەی پێشکەوتنی شارستانی یەتی، بە وێنەیەکی تر ئەتوانین بڵێین کە کەلەپوور مێژووی سیاسی و کومەلایەتی میللەتن، ئەو یاسا ئابووریانەن کە میللەت دەری کردوون، هەر وەها سەرجەمی خیبرەو تاقی کردنەوەکانی ئەدەبی و هونەری و هەموو دەسکەوتوەکانی مەیدانی پزیشکی وکیمیاو وفیزیك و ستێرەوانی و زانستی یەکانی کۆمەلایەتی و دەروون و هەونەرو ئاڤاهی و جوانکاری و جوانکردنن و دیسان ئەو خیبراتانەن کە بەدەست خەڵك دەکەون بە رێگای مومارەساتی رۆژانەی خۆیانەوە، زیاتر لەوە ژی کۆمەڵی هەموو چیرۆك و داستان و ئەفسانەو پەندی پێشینان و نوکتەو بەسەر هات کە لە سەر ئەزمانی خەڵکن و دەگێڕدرێنەوە بە رێبازە جۆراو جۆرەکانی دەبڕین و تەعبیر کردن هەموویان رەنگدانەوەی تاقی کردنەوەکانی دەروونی و ویژدانی و زیرەکی و چالاکی مرۆڤن. بەم رێبازە ژی ئەتوانین کەلەپوور بە سەر سێ وێنەدا دیار کەین و بینینە بەر چاف:

یەکەمیان ئەو کەلەپورەیە کە پڕ لقلقین و زیرەکی و چالاکی و ژیان و گیانی و روحەو لە کۆنترین چەرخەکانی مرۆڤەوە تا نهو هەر ماوەو رەنگدانەوەی گیرو

گرفتەکانی مرۆڤ و مرۆڤایەتی و دەروونین کە توانیویانە تا ئیمڕۆ زیندوو بمینین.
دووەمیان ئەو کەلەپوورەیە کە ڕەنگدانەوەی گیرو گرفتی مەرحەلەیەکن و بەهاو هەڵویستەکانی پەیوەندی بە قوناغێك و کاتێکەوە هەیەو لە سنووری ئەم قوناغ و مەرحەلەدا دەرناچێ وپەیوەندی ی لە گەڵدا هەیە.
سێیەم وێنە ئەو کەلەپوورە بێ گیان و رۆحەیە کە هیچ بەهاو ئەرزشێکی مێژوویيو خیبرەیەکی مرۆڤایەتی تێدا نییەو بێکەڵکەو سوودی لێوەرناگیرێت.
هەر لەبەر ئەم راستییانە دەڵێمەوە کە هیچ پشکێنەرو خوێندەوارو قوتابی ئەدەب کومەڵ و دەروون و ستاتیك و رامیاری و داب و نەریت و رەوشت ناتوانن خۆیان لەم سامانە گرینگە دوورکەنەوە... واتە کەلەپوور.
هەڵوێستی هوزانڤان بەرامبەر کەلەپوور لەم سێ جۆرانەدایە:ـ
یەکەم: پاراستنی کەلەپوورو ناسینی کەلەپوور بە شتێکی پیرۆز کە نابێت هیچ کەس دەستی بۆ درێژکات بە وێنەیەکی گەلێك کۆنە پەرستانە.
دووەم: رەفزی هەموو لایەکی کەلەپوور و یاخیبوون لێی و بەچاوێکی کەم وبێبەها تەماشای دەکات و بە شتێکی خەراپ و ئامێرێکی پاشکەوتن دەناسێت.
سێیەم: هەڵویستی بژارتن و لێکۆڵینەوە و ناسین و پشکنین و هەڵگرتنی جۆری چاك و پڕ سوودو پاشان سوودلێ ی وەرگرتن و لادانی بەشی تر.

## بژارەیی کەلەپوور:

تا بتوانین سوود لە کەلەپوور وەرگرین لە تاقیکردنەوەکانی شیعری ئیمڕۆماندا ئەبێ ئەم راستییانە لە بەر چاومان بن:ـ
١ ـ ئەبێ کەلەپوور بە تێروانینەکی رەخنەیی زاتی تەماشا بکرێت، بە وێنەیەکی فرەوانەوە، چونکە کەلەپوور شتێك نییە بخوێنینەوەو لە بەری کەین و هەڵی گرین بەڵکو دەبێ تێدا بژین و مومارەسەی بکەین، هەر لە بەر ئەوە ئەبێ کەلەپوور بێژینك بکرێت و هەزم بکرێت و هەوڵی ئەوە بدرێت کەلەپوورەکە بڵند بکرێت تا بگاتە ئاستی مەسەلەکانی مرۆڤایەتی هاوچەرخمان.
٢ ـ ئەبێ پەیوەندییەکی جەدەلی پەیدا بکەین لە نێوان مەسەلەکانی رابردوو مێژوویی و ئەو ئاست و مەسەلە هاوچەرخییانەی کەلەپوورەکە تێدا بە کار دەهێنرێت.

٣ ـ ئەبێ پەیوەندی‌یەکی هاوسەنگ لە نێوان تێروانینی زاتی هوزانڤان لە لایەك‌و کارتێکردن‌و تەفاعولی بەهایەکانی نێو چوارچێوەی مێژووی کەلەپوور لە لای ترەوە هەبێ هەر لە بەر ئەوە دووبارە دەڵێمەوە کە کەلەپوورمان وەك سەروچاوەیەکی بۆشە(٤) وپڕە لە جوانکاری‌و داهێنان‌و پێویستمان بەوە نی‌یە کە ئێمە کەلەپوور بە وێنەی تۆمارکردن لە ناو شیعرماندا بە کاری بێنین چونکە تۆمارکردنی کەلەپوور کاری لایەکی‌ترە.. هەر وەها کاری شاعیریش ئەوە نی‌یە کە تەزمینی کەلەپوور بکات لە ناو شیعری‌دا بەڵکو کارەکەی ئەوەیە کە ئەو تواناو هێزانەی لە ناو کەلەپووردان ئاشکرا بکرێن وببێنە بەر چاڤ. ئەو تواناو هێزانەی هانی داهێنەر دەدەن بۆ ئەوەی نهویەی باس دەکات لە خیلالی مێژوو و رابردوودا بۆ تێپەرکردنی ئەو نهویە بەرەو ئایندەیەکی خۆش... هەر لەبەر ئەم راستی‌یانە شاعیری هاوچەرخمان پێویستی بەهەست‌و بیرو وەعیەکی چاکە کە لە حەقیقەت‌و راستی ـ یەکانی کەلەپوور تێبگات‌و بژارە بکات وبیکاتە سامانی خۆی.

## سەرو چاوەکانی کەلەپوور..

١ ـ زمان... بە وشەو پەیڤ‌و پیت‌و رستەو جوانی و ستاتیك‌و جوانکاری‌ی زمانەکەوە، هەر وەها شێوەکانی زمانیش کە نیشانەی دەوڵەمەندی زمانن، ئەو زمانەی ئامێرو هاندەری تێروانینەکانی داهێنانی هونەرین لە ناو رێبازی شیعری هاوچەرخماندا.

٢ ـ مێژووی مرۆڤایەتی بە هەموو لایەکی‌یەوە.

٣ ـ هەموو تاقی‌کردنەوەکان‌و خیبرەی ئەدەبی‌و هونەری‌و زانستی کە تۆمار کراون وەك کتێب‌و بلاوکراوەکان‌و دەست نووسەکان.

٤ ـ بەیت واتە مەلحەمە وچیرۆك‌و داستان و ئەفسانەو بەسەرهاتی میللی کە بە زمان دەگێڕینەوە وتۆمار نەکراون.

٥ ـ هەموو رەوشت‌و کارو داب‌و نەریت و جولانەوکانی میللی کە لە ناو هەمە جۆری چینەکانی میللەتدا پارێزراون.

٦ ـ یاری‌و پەندی پێشینان‌و جوك‌و نوکتەو مەتەڵ‌و هتد...

## شیعری کوردی له مه‌یدانی که‌له‌پووردا..

ئه‌و سه‌رو چاوانه‌ی شیعری ئێمروی کوردی په‌نایان بۆ ده‌با و به‌کار یان دێنێو ته‌فاعولیان له گه‌ڵ ده‌کاو سوودیان لێ وه‌ده‌گرێتو له ناو شیعری هاوچه‌رخماندا ده‌دۆزینه‌وه ئه‌مانه‌ن:

١ ـ که‌له‌پووری تایبه‌تی میلله‌تی کورد ئه‌و ژی به‌م رێگایانه‌دا:ـ

أ ـ مێژووی میلله‌تی کورد به هه‌موو سه‌رکه‌وتنو داکه‌وتن و گیرو گرفته‌کانی یه‌وه.

ب ـ فولکلۆری کوردی به هه‌موو لایه‌کانی‌یه‌وه... ئه‌و فولکلۆره‌ی خاوه‌نی نی‌یه‌و تومار نه‌کراوه و له سه‌ر زمانی میلله‌ته‌و خاوه‌نیش هه‌ر میلله‌ته‌و نه‌وه بۆ نه‌وه‌ی ده‌گێرنه‌وه وه‌ك به‌یتو چیرۆكو داستان وئه‌فسانه‌و په‌ندی پێشنیانو لاوكو حه‌یرانو به‌سته‌و گۆرانیو هه‌موو شته‌کانی فولکلوری.

حـ ـ شه‌خسیاتی ئه‌ده‌بی وه‌ك شاعیرو لاوك بێژو گۆرانی بێژ، یان پاڵه‌وانانی مێژووی کورد یان ناودارانی چیرۆکه‌کانی فولکلوری کوردی.

ی ـ دابو نه‌ریتو کاره‌کانی کۆمه‌لایه‌تیو ده‌روونی مرۆڤی کورد.

هـ ـ سروشتو دێو شارو چیاو دیمه‌نه‌کانی کوردستانو وه‌زعی رامیاری میلله‌تی کورد.

٢ ـ که‌له‌پووری دراوسی‌یه‌کانی میلله‌تی کورد ئه‌وانه‌ش:

أ ـ که‌له‌پووری میلله‌تی عاره‌ب ئه‌وه‌ش به‌دوو وێنه‌دا:

١ ـ که‌له‌پووری کۆنی ئیسلامو به‌تایبه‌تی قورئانو چیرۆکه‌کانی ئاینی.

٢ ـ که‌له‌پووری نوێو مێژووی نوێی میلله‌تی عاره‌ب به تایبه‌تی مه‌سه‌له‌ی فه‌له‌ستین.

ب ـ که‌له‌پووری میلله‌تی فارس. ئه‌م که‌له‌پوره ژی کاری‌کردووته سه‌ر شاعیری هاوچه‌رخمان به تایبه‌تی ناودارانی کۆنی مێژووی فارسو چیرۆكو داستانو ئه‌فسانه‌کانی کۆنی فارسی هه‌روه‌ها مێژووو ئه‌ده‌بی نوێی فارسی کاری کردووته سه‌ر شیعری کوردی هاوچه‌رخمان.

حـ ـ که‌له‌پووری میلله‌تی تورك: تا راده‌یه‌ك کاری کردۆته سه‌ر شاعیری هاوچه‌رخمان به تایبه‌تی مێژووو ئه‌ده‌بی نوێی تورکیا.

٣ ـ که‌له‌پووری جیهان: به هه‌موو تایبه‌تی‌یه‌کانو تایه‌کانی کۆنو نوێو له سه‌ر هه‌موو ئاسته‌کانی ئه‌م که‌له‌پووره، ئه‌وی شیاوی باسه ئه‌م که‌له‌پووره به‌رێگای

وەرگێڕان بە شاعیری هاوچەرخمان دەکات، چی بە زانینی شاعیری کورد زمانی میللەتانی جیهان یان مانەوەی شاعیر لە ناو ئەو میللەتانە لە جیهانی دوور یان ژی بە وەرگێڕانی ئەم ئەدەبە جیهانی یە بۆ سەر زمانی میللەتە دراوسێیەکانی کورد وەك عارەب یا فارسی و تورکی.

## چون هوزانڤانی کورد کەلەپوور بە کار دینێت:ـ

شتێکی ئاشکراو بەدیهی یە کە «رابردوو ئامادەبوون و حوزورێکی حەتمی هەیە لە نێو نهوماندا و هیچ هێزو شۆڕشێك ناتوانێت خۆی لێ لادات چونکە ئەم رابردوویە لە چیابەکان سەنگینترە، وبە هیچ کەس ناکرێت ئەم رابردوویە ب هەرفینیت و بروخێنێت و هەر وەك «د. احسان عباس» دەڵێت:. «**بیرکردنەوەو هەستی شاعیر بۆ جەماوەری شیعرەکەی پێش هەموو شتێك تەحدیدی هەلوێستی شاعیر دەکات بەرامبەر کەلەپور... هەر وەك دیارە هیندەك شاعیر وا دەزانن کە شیعر کارو فەعالیەتێکی مرۆڤایەتی یە و ئەبێ کۆمەڵ هوشیار بکاو لە خەو هەڵیانسێنێ و لەم بوارەدا ئاخاوتن لە گەڵ کۆمەڵ یا جەماوەر، گەڕانەوە بۆ کەلەپوور دەچەسپێنێ تا بە چاکی لە هوزانەکەی بگەن و تام وچێژی لێ وەربگرێت**». هەر لە بەر ئەم شتە شاعیری کورد کە مامەڵە لە گەڵ کەلەپوور دەکات لە روانگەو گۆشەی جیاوازدا تێوری و تێڕوانین و مامەڵە کە دیار دەبێت... لێرەدا ئەتوانم چەند لایەکی ئەم مامەڵەیە ئاشکرا بکەم کە دوور نی یە هەموو لایەکانی وەك یەك بە کار نەهێنرێن یان چەند لایەك پێکەوە بە کار بهێنرێن ئەوە جیاوازی شاعیر بۆ ئەوی تر دیاری دەکات.. ئەم لایانە ژی ئەمانەن:

یەکەم: لای کەلەپووری میللی.. ئەم کەلەپوورە دەوڵەنمەندو پڕ نرخەی میللی کە لە ناو هەست و بیرو مێشکی میللەتدا دەژێت و بە سەر زمانیاندا دەگوێزرێتەوە نەوە بۆ نەوە... لە کاتی پەنا بردنی شاعیر بۆ ئەم کەلەپوورە میللی یە و هێنانە بەر چاوی خەڵك وەك خۆی لە هەموو سنورو توخیبەکانی فولوکلۆردا و بە کارهێنانی مەسەلەکە لە ناو شیعردا بە بێ گوڕانی کەسەکان و ناوەڕۆکی مەسەلە مەزنەکەی کەلەپوور چێ ڤیان یا جەورو ستەم یا زیرەکی و پاڵەوانی لە ناو

کەلەپووری میللیدا... هەر هیند شاعیر لە ژێر پەردەی ئەم کەلەپوورەدا چی لە دڵدایە دەڵێتو میللەت هوشیار دەکاتو هەستی نەتەوایەتی خەڵك دەبزوێنێ.. بۆ نموونە «ژ ئەڤینا جراێن کەڤن» «عبدالرحمن مزوری» و «سلاڤەك بو دەلالێ ی» «خالد حوسین» و «فەقی تەیران»ی «ئەنوەر قادر جاف»و «خانیو حاجی قادر» لە لای «عبدالله پەشێو»و «جەوهەر کرمانج» و مؤید طیبو «صلاح شوان» و «لطیف هەڵمەت»و «خەلیل دهۆکی» و «عبدالله عباس» و تێلی ئەمین و گەلێك هوزانڤانی کوردی تر. لێرەدا ئەبێ بڵێم کە هیچ غەریب نی یە خەڵك ئەم جورە بە کارهێنانەی کەلەپووری میللی مان پێخۆش بێ؛ چونکە رەنگدانەوەی هەستو بیریانە بە ئاخوتنی ناسراوی سەر زمانی خەڵك و پەندی پێشینانو کارو یاریو رەوشت و نەریتی میللی هەر وەها گۆرانیو سترانی کوردی تێدا واتە لە شیعری ئیمرۆماندا بە کاردێنن و خەڵك زۆری پێخوشە.

دوەم: بە کارهێنانی کەلەپوور وەك دەمامك و قیناع... واتە شاعیرکەسێکی مێژوویيو کەلەپووری وەك دەمامك بە کاری دێنێو خۆی لە پشتی ئەم قیناعەدا دەشارێتەوە و بیرو فیکری خۆی بەزمانی ئەم کەسە دێنێتە بەر چاڤ، ئەم کەسانەی دەبنە دەمامك بو شاعیرانمان «کاوەیە، خانی، جزیری نالی، حەبیبە، شیرینو فەرهاد، نازم حیکمەت، نیرۆن، نیرودا، لۆرکا، ئیلزای ئەراگۆن.. هتد» یان ژی هەر ناوێکی دەسکردە و هوزانڤان وەك دەمامك بەکاری دێنێ و خوی لە پشت ئەم دەمامکە دەشارێتەوە و هەر چی دەیەوێ بەزمانی دەمامکەوە دەڵێتەوە.

سێیەم: بە کار هێنانی کەلەپوور وەك ئاوێنە کە شاعیرانمان خۆیان تێدا دەبینێتەوە، یان ئەو مەسەلەی کەلەپووری.. هوزانڤان دەکاتە ئاوێنەیەك و پێشانی خەڵك دەدات بۆ ئەوەی مەسەلەکانو گیرو گرفتی هاوچەرخی خۆمانی تێدا ببینن‌ەوەو بەم وێنەیە شاعیر مەسەلەی کەلەپووری وەك ئاوێنەو پەردەی سینەما پێشانی خەڵك دەداتەوە تا ژانو خۆشیو هەستو بیرو دەروونو دەوروبەری خۆیان لەم ئاوێنەدا ببینن‌ەوەو گەلێك بەچاکی ئەم لایە دیارە لە ناو شیعری کوردی هاوچەرخماندا.

**«نمونەکانی بە کارهێنانی کەلەپوور لە شیعری کوردی هاوچەرخماندا».**

لێرەدا بە پێی دابەشکردنی سەروچاوەکانی کەلەپوور کە شاعیرمان

مامەڵە لە گەڵ دەکات و بەکاری هێناوە بەکاری دینێ چەند نموونەیەك دێنمە بەر چاف:ـ

١ ـ فولکلۆری کوردی: بە هەموو لایەکی یەوە:

یەکەم نموونە شیعری «گۆران» ی مەزنە کە دەڵێت:ـ

**«ئەوە ندەم بیست لە موسیقا خروشی رۆحی بێگانە[٥] میزاجی کوردەواریم تێك چووە دەرویش عەبدواللە دەخیلت بم، دەسا بەو لاوکو ئای ئای و حەیرانە شەپولی زەوقی میللی پر دەروونی ماتو چولم کە لە بێتهوفن گەلێ زیاتر بە روحم ئاشنای وڵلا دە ئەی دەروێش..! ساکالایەك لە گەڵ روحی کلۆلم کە»**

نەورۆز وەك سەروچاوەیەکی کەلەپووری ڕۆشەن و دیار وەك رەمزێکی میللی هیچ شاعیرەکی کورد نی یە باسی نەکردبێ و زۆر لە سەر ئەم مەسەلەیە نووسراوە هەر لە بەر ئەوە بە چاکم زانی کە نموونەکانی نەورۆز باس نەکەم لە بەر ئەوەی هیچ کەس نی یە گوێی لێ نەبێت.

دیسان دەگەرێنەوە سەر نموونەکانی فولکلۆرو شاعیری گەنجو هێژا «مؤید طیب» وەك لە سەر سترانی «خەزال» دەڵێت..

**«خەزال... خەزال....[٦]**

**کێ گوتی یە تە..؟!**

**دێوەك هاتو**

**دەستێت خو دانە بن گارەی..**

**ژ واری مە بر**

**ئاڤی ی ژ رویبارێت مە بارکر.....»**

**تا د بێژیت:ـ**

**«نە خەزال نە..**

**گارە هەر لجهێ خو مای**

**هێش کیفی یێ لێ د چەرن**

**چوکێت مە هەر ئاڤا تێ مای**

**رویبارێت مە هەر یێ د گەرن**

**سالو زفستان و بەفر**

**سل نەبوینە هەر هەڤالن»**

دیسان «عەبدوالله پەشێو» پەنجە بۆ مەسەلەیەکی فۆلکلوری «باران» وا دەکێشێت و دەڵێت:

«هاتن... هاتن... کوسە هاتن[7]

هاتن.. هاتن... دەرگە داخەن... کوسە هاتن،

«هەیاران و مەیاران

یا خوا داکاتە باران

بۆ فەقیرو هەژاران».

فەیسەل مستەفای شاعیر گۆرانییەکی منالانی لە ناو شیعری خۆیدا بەکاری دینێ و زۆر بە جوانی سوودی لێ وەردەگرێت و دەڵێت:ـ

**«خالخالوکێ... خال خشکۆکێ**

**من نەڤێتن هزار سالا[8]**

**بزانمە ب مالێت خالا**

**دل بۆ خالا ژی د کوزرن**

**بەلێ پا دلبەر فەرترن»**

«سەعدوالله پەرۆش» وێنەیەکی جوانی فۆلکلۆری کوردی دەڤ ژەنی و دەروێش لە شیعری خۆیدا بە کاری دێنی و دەڵێت:ـ

**«دە خێرا دەی[9]**

**دەروێشەکانی دەفژەنی بیرەوەری هەلاو گرتووم**

**دەڤ ژانی ماسۆری موچرکاویتان**

**لە تەکیەی گیانی ویرانی نامرادیما لێبدەن**

**ئەوا شێخی دڵی سەرخۆشی عەشقیشم**

**لە گەلتانا.... لە حەلقەی زیکرو حالدایە».**

جەوهەر کرمانجیش «های.. های مەمو» لە ناو شیعرەکەیدا بە کاردێنی کە شتێکی نەمری کەلەپووری کوردییە وەك دەڵێت:

**«وەرە تا ئەمجارە ببمە**

**گوڵە سپی یە حاجیلەیێ[11]**

**لە دەوری گێلکیلەی سەرت**

**وەرە ئەی عەشقە پاکەکەی دونیای خەفەت**

**تا بۆت ببمە کراسێکی**

**گوڵ گوڵی سوری پڕمەینەت**

**«های... های مەمو...**
**عەباسی خۆش عەباسی**
**گیانە... مەمو...**
**لە دوور دەنگی تۆم ناسی»**

دیسان عەبدوالرەحمان مزوری بەیتە شیعرەکی فۆلکلوری بەکار دێنێت کە دەلێن هی «فقێ تەیران» ە بەلاّم بەکار هێنانەکەی مزوری گەلێك لە ئەسلەکەی جوانترو رێك و پێکترە وەك د بێژیت:ـ

**«هەی ئاف و ئاف**
**هەی ئاف و ئاف[12]**
**تە دل تەژی رازو سرە**
**تەژی گەرداف**
**راستە هەنە... د بەرپەرێن چاخێ بیستێدا**
**بو نانەکا سوتی و خاف**
**خو بکەنە تاژی بو خەلکی**
**بکەنە پێلاف:»**

ئەم لایە فۆلکۆریانە وەك ئاوێنەو دەمامك بەكار دێن لە ناو شیعری شاعیرانماندا دیسان لایەکی تر کە ناوی کەسەکانی فۆلکلۆرو کەلەپووری کوردی هەروەها پالەوانانی مێژوویی ژی وەك ئەوەی مؤید طیب باسی کاوە دەکات لە شیعرەکدا و دەلێت:ـ «**گوتن هەی هو**[13] .

**رۆژا چەکوچێ کاوەی چو... ناهێتەڤە**
**ل وەلاتەکی ئەژدەهایەك بتنێ هەبو...**
**نها... نهو... ل هەر شارەکی**
**ل هەر گوندەکی**
**ئەژ دە هایەك یێ خورێتن**
**لێ نەگوتن... ل هەر شارەکی.. ل هەر گوندەکی**
**ب هەزارا جوتیارو رێنجبەرو پالەنە**
**هەمی جوتیارو پالە ژی**
**ئەڤرو چەکوچ و کاوەنە»**

یان وەك «لەتیف هەلمەت» ناوی «نالی و حەبیبە» و «سالم» دێنێت و دەلێت: «**نالی دەرواو ئەم گوزەرە بە جێ دێلێ**[14]
**حبیبەی خۆی هەرگیز لە بیر نا چێتەوە»**

تادبێژیت:

**دەوەرە چاوی «سالم» هێندە گریا**

**«تانجەرۆ» و «سیروان» سویر بو**

**چاوی «سالم» هێندە گریا**

یان نەوزاد رەفعەت ناوی «حەمە ئاغای دەربەن فەقەرەی»شاعیرو «مەولانا خالید» لە ناو شیعرێکدا دێنێت و دبێژێت:-

**«گریام... مەگەر «حەماغای دەربەن فەقەرە[١٥]**

**ئاوا لە سەر دونیای چۆڵو**

**گلکۆی تازەی لەیل» گریابێ**

**مەگەر چرای خانەقایەکی موکریان**

**ئاوا لە تاو کۆچی «مەولانا خالید» سوتابێ..»**

دیسان تێلی ئەمینی شاعیر ناڤی خانی دێنێت ودبێژێت:-

**«قوربان خانی... هلو قوربان... ئەڤە هاتم**

**ئەز هەژارەکێ بێ دوستم..»**

محسین ئاوارەی شاعیر «دمدم»و «خانزادی»ی بە کارهێناوەو دەڵێت

**«هەڵم هێنا... قەڵاکەی «دمدم» م بینی[١٧]**

**«خانزاد» ی سەرسەختم بینی**

**وەکو دوو منداڵی ساوا....»**

یان کە «عبدالله عباس «فاتە» ی دەکاتە رەمزی خۆشەویستی و هیواو هیڤیەکانی ناو دەروونی خۆیدا لە گەڵ «سیروان» یەکدەگرنەوە کە دەڵێت:

**«کچێ فاتە[١٨]**

**«سیروان» شینە**

**غەم ئەباتۆغەم ئەهینێ**

**هەر ئەرژێینە ساتەکانی بینینەوە».**

حەمەی حەمە باقی شاعیر ئاماژە بۆ «عەلی بەردەشانی» دەکات و دەڵێت:

**«ئای ئەمە «عەلی بەردەشانی‌یە»[١٩]**

**گۆرانیەکمان بۆ بڵێ**

**ناکەم خزمەتی وەزیری**

**نانی دەستێنم بە شیری»**

بە کارهێنانی ناوی مێژوویی و ئەدەبی و کەلەپوور گەلێك زۆرە کە چی

کوردی‌یەو دیداری سێهەمی چیرۆکی کوردی‌یەو تەنیا بانگەوازی ئەم گۆڤارە بۆئەوەیە کە ویژەوانانو ویژە خوازانی کورد بتوانن بەرهەمەکانیان دەربخەن بەروونیو ئاشکرای لەو مەیدانە داپێشانی رۆشنبیرانو دۆستانی شیعرو چیرۆکی کوردی بدەن، لە گەلّ ئەوەی لە عیراقی خۆشە ویستماندا دەرئەچیّ. ئەو عیراقەی کە بۆ پێنج سالّ ئەچیّ لە لایەن رژێمی رەگەز پەرستی ئێرانەوە شەری بەسەردا سەپێراوە.. ئەو عیراقەی کە هەمیشە سەرکەوتووەو سەرکە وتوو ئەبیّ، گۆڤارە کەمان شان بە شانی ئەمە داوا لە هەموو رۆشبنیرو نووسەرێکی کورد ئەکات.. کە بەرهەمە بەکەڵكو بەپێزەکانیان بنیرنو هەر گیز دەرگا بەروی هیچ بەرهەمیّکی پەرەسەندووی فەرداردا داناخاتو ئێمەش لە لایەن خۆمانەوە بەسنگ فراوانی‌یەوە ئەڵێین بانووسەرانو رۆشنبیرانی کورد لەم بوارەدا خۆیان تاقی بکەنەوە تا گۆڤارەکەیان بەچاوی خۆیینن کە لە سایەی هیمەتی هەموانەوە چۆن گەیشتۆتە پایەیەکی خواستراو.

مەبەستیش لەم نووسینە ئەوە نیە کە بلێین نووسەرو رۆشنبیری کورد هەست بەم لایەنە ناکەنو بێین بیریان بخەینەوە.. بەلاّم ئەوەی کە هەیە ئەوە یە کە رەنگە بەشی زۆریان ئەم راستی‌یە بزانن‌و ئەوەشی کە پێویستەو ئەشبیّو بکرێو ئەرکێکە لە ئەستۆ دایە بەشداری کردنی هەموو ئەو خامە نەسرەو توانەن کە شەیداو کوژراوی پێشخستنی وشەی کوردینو بە شوێن دەلاقەیەکدا ئەگەڕێن کە لێ یەوە بچنە ژوریو ئەم تەقە للاپیرۆزو رووناکە بدەن.

ئەمڕۆش گۆڤاری نووسەری کورد وەك هەموو گوڤارو رۆژنامەیەکی تری کوردی کە دەرئەچێت ئەو دەلاقەیەیە کە ئەو خامانە بەشوێنیاندا ئەگەڕێن‌بابێن لە مەیدانەکانیدا بەخشش‌و پلەی بەرهەمەکانیان تاقی بکەنەوە. لە دواییشدا ئاواتە خوازی ئەوەین کە ولاّتەکەمان بە سەر رژێمە رەگەزپە رستەکەی ئێران سەرکەوێت‌و میللەتی عیراق بە کوردو عەرب‌و باقی کەمایەتی‌یەکانی یەوە بە خۆشی‌و شادی بژین لە ژێر ئالاّی سەرۆکی کۆمارە خۆشە ویستەکەمان صدام حسین.

ئیتر ئاواتەخوازین کە ئالاّی سەرکەوتن هەمیشە شەکاوە بێت. ولاّتەکەمان سەرکەوتوو بێت.

**نووسەری کورد**

ئەمانەوێ باسی داب و نەریت و کارەکانی کۆمەڵایەتی و فۆلکلۆری کوردی کە لە ئاو شیعری شاعیرانمان بە کار هاتووە وەك مامۆستا خالید دلێری شاعیر پەنجە بۆ بردنی بووکی مەلان بە ئاسمانەوە وەك دەڵێت : ـ

« پـولی مـەلان بـوکێ دەبـەن[20]
کـێ دەڵێ کـێ بـۆ کـێ دەبـەن
چـلی شـایـشیـان هـەر ڕەشـە
ڕیـشـوڵە هـەر ڕەشی بـەشـە
بـلێی : جـوانی بـۆ پـیر بـەرن
بـۆ دەوڵەمـەنـد ، فـەقـیر بـەرن
بـلێی : ئەم بـووکـە شـیر بـایی
خـورا بـێ هـەر بـە سـاوایـی
بـلێی : ژن بـە ژن کـرابـێ
یـا لە بـریـنـی خـوێـن درابـێ

« مؤيد طيب » ی شاعیر هێران و درووەنەوەو نانکردن وێنە دەکێشی لەم شیعرەدا وەك دبێژێت :

« هەتا سەرێ گولیا گەنمی نەبرن[21]
جەنجەر نەکەن
دو جارکی ل ئاشی هوین نەکەن
هەڤیر نەکەن
ل بن سێلا ڕەش .. ئاگرەکێ سور هەل نەکەن
نا بێتە نان .. نابیتە نان »

لایەکی تری بەکار هێنانی کەلەپور لە ناو شیعری هاوچەرخماندا پەندی پێشینانەو شورەسواری ئەم بوارە پیرەمێردی نەمرە هەروەها دلداری شاعیر دەڵێت و پەنجە بۆ بەندی « بیورە دار دەبرێت »[22] رادەکێشت « دەمی « بیور » عەدوی دارە ، بەلام کلکی ئەویش دارە بە هۆی کوردە ئەتو غافل کە ئەمرو شکانراوی »

یان وەك « مؤيد طيب » پەندی « بەحرب دەڤی سا پیس نابیت» بە کار دێنێت و دەڵێت : « نەتو بەحری و[23]

بەحرب دەڤێ سا پیس نابیت
دل ژ ئەڤینێ ریس نابیت »
یان وەك خالید دلێری شاعیر دبێژێت :
« بابە زمانی خۆت پێت بلێم داپیرە گیان[٢٤]
کورە شوان دەبێ تا مردن هەر شوان بێ ..؟
هەروەسا « عبدالرحمن مزوری » دەبێژێت :
**« کلیلا بێدەری بایە[٢٥]**
**دوژمنی تاریی چرایە**
**خو بکەنە با .. دا بێدەرا خو هەلگرن**
**بکەنە چرا ..**
**دا مژو تاری نەچەری .. دا نەچەرن »**
**دووەم سەرو چاوەی کەلەپوور کە شیعری هاوچەرخمان سوودی لێوەردەگرێت کەلەپووری دراوسێیەکانە ئەو ژی :**

ا ـ کەلەپووری عارەبی... میللەتی عارەب کەلەپوورێکی تۆمارکراوی گەلێك مەزنی هەیە و لە رێگای ئاینی ئیسلامەوە هاتۆتە ناو ئەدەبی کوردی کۆن و نوێمانەوە و بە دوو وێنە ژی لە ئەدەبی هاوچەرخماندا دێتە بە رچاو:

١ ـ کەلەپووری کەڤنی عارەبی و ئاینی ئیسلام وەك قورئان و چیرۆکەکانی ئایینی و بیرو فیکری ئیسلامی وەك «مؤید طیب» ئیشارەت بۆ چیرۆکی ئادەم دەکاو دیبێژێت: «**ئەگەر راستە... «ئادەم» ژ ئاخێ چێبویە[٢٦]**
**ـ حەوا ـ ژ پەراسیا وی بویە**
**ژ ئەڤرو پێڤە**
**ئەز نە کورێ ئادەمیمە**
**چنکی نەژادێ من بەفرەو.... یێ وی ئاخە».**
یان «شێرکۆ» ی شاعیر چیرۆکی بوراق دێنێتە ناو شیعری داو دەڵێت:
**«توش «بوراق» بە[٢٧]**
**«بوم بە «بوراقی» پەیامی سووتاوەکان بووم بە پێرەو**
**بە زەریاکەی ناو ڕۆمانی کۆچی ئەمجارەی پەری خان»»**
«عبدالرحمن مزوری» ژی چیرۆکی «ئەیوب» پێغەمبەر بەکاری دینێت و دەڵێت:

«ئەیوبم ئەز... صەبر فڕی
دل مشتە ژ کوڤاناو پڕی
یان دێ مرم... یان ڕۆژ هە،... یا نفستیو دگری
دێ هوشیارکەمو هاژومە
بەر دەرگەهێن کولکو خانیکێن گوندێمە...
بەلکی بگریت... جهێ چراکێن ڤەمری..»
هەروەها جەوهەر کرمانج چیرۆکی عیسا ومەحەمەدو مەهدی بە کاردینێو دەڵێت: «مەحەمەدی مەهدی هێشتا..[28]
لە سێبەری دارگەنما...
بەرماڵەکەی ڕاخستوە.. هەتا ئێستا..»
تا دەڵێت: «عیسای زەمان دێتە خوارێ
گوڕبو تەجال هەلدەکەنێ
حەمەی مەهدیش ووردە ووردە
بەهەشتی خوا بە جێ دێڵێو
بۆ کوردستان هەنگاو دەنێ»
«صبری بۆتانی» شاعیری تەرو ناسك پەنجە بۆ چیرۆکی کـۆچی پیغەمبـەر لە «مەکە» بەرەو «مەدینە» رادەکێشێو دەڵێت:ـ
«چ خوش کار بو ئەوا تەکر[29]
بو مەحەمەدو ئەبابەکر
ب وێ تەڤنا تە راچاندی
داڤ داڤ ل شکەفتێ ئالاندی
هەزار کیندار پێ خاپاندی..»
«لەتیف هەڵمەت»ی شاعیر ئیشارەتی بۆ داری موسا دەکاتو دەڵێت:
«گەر دارەکەی موسام دەبو[30]
خۆمم دەکرد بە گوێزان
هەمو یاساو سنورێکم دەکرد بەمۆ»

«ئەنوەر قادر جاف» ژی پەنجە بۆ خاچەکانی مـەسیحی رادەکێشێت و دەڵێت:
«تەمی چاوی هۆنراوەکان[31]
پرشنگی سوور ئەناسێنێ

**خۆشەویستیو پەیامی سپی عیسایە**
**تە نانەت دڵی خاچەکان ئەگرینێ».**

«عبدالرحمن مزوری» ژی ناوی «محمود درویش» و مەسەلەکەی بە کاردبێت و دبێژیت: «**دابێژم ئەز**[٣٢]
**بو چی خەمێن پرتەقالێن،**
**جنینکا «محمود درویش» ی**
**بوینە گلوازو تلوقە..**
**بو چی وەرزێ**
**«خانی» ژ دل پەرجانکری**
**هەرێ بێ دانو بێ تۆفە».**

«عبدالرزاق بیمار» ژی ئیشارەت بۆ «فلسطین» دەکاتو دەڵێت:
«**دەستو شانێك لە قودسەوە**[٣٣]
**نەك ئێستا بەڵكو لەو ساوە کە وەرگەران**
**«فەلەستینیان» بە دووکەڵی ستەم خنکان»**

هەر وەها لە سەر عەینی مەسەلە «تێلی ئەمین» دەڵێت:
«**ئەز رەنگیەکێ رەشو روونم**[٣٤]
**ژ ئەفریقیا... دەنگێ زەلالێ زنجی یا**
**تاکێ زەیتونا قودسێ مە**
**شورەشا فەلەستینێ مە».**

دیسان شێخ حەسیب قەرەداغی ی شاعیر لە بارەی مەسەلەی فەلەستینەوە دەڵێت: «**هەر کە تۆفان فەلەستینی داگرتوە**[٣٥]
**کەشتی ی ماڵە پیمپراوەکان بە ناڕازی**
**گێژاو بردی بۆ بەندەری لانەوازی»**

یان وەك شاعیری هەمیشە سەرخۆشو لە هەموو قەسیدە پڕلە (مەی) یەکانی کاکە، صلاح شوان باسی مەیخانەکانی بەغدا دەکات و دەڵێت:
«**لە قوژبنێکی تاریکی**[٣٦]
**مەیخانەیەی بەغدادا**
**ئەخۆمەوەو... باست ئەکەم**
**باست ئەکەمو، ئەگریمو ئەخومەوە**
**تا لە بیرم ئەچیتەوە»**

ب - دووەم کەلەپووری دراوسێیەکان کەلەپووری فارسی یە بە وێنەی ئەفسانەو ناوی کۆنی پاڵەوانەکان و کەسی مێژوویی و ئەدەبی کۆن و نوێ هەر وەك «أنور قادر جاف» ی شاعیر لە قەسیدەی «گوڵی سورخی لە هەریمی مەرگا سۆز ئەکا» دەڵێت:

**«چونت توانی خۆت بخەیتە ئەو کوچی هات و نەهاتە**

**«چونت توانی بێ‌پێ بە پێ‌پیلکەکاندا بێتە خوارێ..؟»[37]**

**«دامون» مکردە گلۆپ و لە سەر شەقامی بە نازی**

**بە جێم هێشت و دامە دەست برووسکەو باران»**

یان ژی بە تەزمینی بەیتی شیعری فارسی وەك «هێمن»ی شاعیر دەڵێت:

**«مەستی مەستەم ساقیا دەستەم بگیر[38]**

**تا نە ئوفتادەم ز پا دەستەم بگیر**

**جا کە سەرخۆش بووم بە دەنگێکی ئەوی**

**بۆت دەڵێم ئەو شیعرە بەرزەی مەولەوی**

**«بشنەو ئەز نەی چون حیکایەت میکونەد**

**ئەز جودائیها شیکایەت میکونەد»**

حـ - کەلەپووری سێیەمی دراوسێیەکان کەلەپووری تورکی یە:- ئەوێ شیاوی باسە کە ئەم کەلەپوورە بە کەمی لە لای شاعیری کوردی عیراقدا بەکار دێت هەر هێندە یە کە ناوی هێندەك کەسانی ئەدەبی وەك «نازم حیکمەت» بەکاردێت لە ناو شیعری ئیمرۆماندا.

٣ - کەلەپووری جیهانی بە وێنەیەکی یەکجار زۆر لە نـاو شیعری شـاعیرانی ئیمرۆماندا هەیەو بە چاکی بە کاریان هێناوەو ئەتوانم بلێم کە شاعیری ئیمرۆی کورد نی یە باسی کەلەپووری جیهانی نەکردبێ. ئەم کەلەپوورە ژی بە دوو وێنە دێتە بەر چاو، کەلەپووری کۆن وەك ئەفسانەو چیرۆك و داستانە کۆنەکانی یۆنانی یان هەر میللەتێکی جیهانی‌تر هەر وەها کەلەپووری نوێی جیهان کە لە دوور ترین جێگای خۆرهەڵات تا دوورترین نوقتەی رۆژ ئاوا خۆی لە ئامێزی شیعری ئیمرۆی کوردیان دەگرێتە باوەش و ئێمەش بەم دابەشکردنەدا دەیخەینە بەر چاو:-

ا - ئەفسانەکانی یۆنانی هەر وەك کاکە «صلاح شوان» دەڵێت:-

**«دلدارەکەم...**

**من سیزیفێکم گشت رۆژێك[39]**

**بە پێپیلکانەی شکاوی**

**تیشکی گەرد گرتووی هەتاوا**
**بەرەو لای‌تۆ سەر ئەکەوم»**

هەر وەها کاکە حەمە باقی ئیشارەتی بۆ «هێلین» و «تەروادە» دەکات‌و دەڵێت: «**من نەمزانی چەقۆکێشەکانی پاریس**[٤٠]
**کوڕو، کوڕە زای «طەروادە»ن**
**لە خوانی میواندا‌ریشا**
**پەلەماری «هێلین» ی خانە خوی ئەدەن..»**

وێنەی دووەم وێنەی کەلەپووری نـوێ جیهانـە هەر وەك «عبـدالرحمن مزوری» ناوی «نیرودا» و «لۆرکا» دێنێت و دبێژێت:ـ[٤١]
**«ئەو بەهارا**
**«نیرودا» ی پالدایەناف**
**خەرت‌و شوڤە**
**خانما دلیەرا «لورکای»**
**ژ ناڤ دەفتەرەکا شیعرێن و ی**
**رابو چوڤە...»**

دیسـان ئەنـاهیتای حـەمەدەمـین پێنجـوێنی وێنـەیـەکی چـاکی ئـەم مەسەلەیە وەك دبێژێت:ـ مزەی من تیشکی چاوێکە
**ئەگەر مەیلی بکەی ڤینۆس**
**وەکو لێزەر... ئەم دیو ئەو دیو**
**جەرگەو هەناوم کون ئەکا ئەنافیتا**
فەرید زامداریش. ئەفریقیاو فیتنام‌و فەلەستین بە کاردێنی:ـ
**«لە ڤیتنام و ئەفریقیا.. لە مەڵبەندی فەلەستین داگیرکراو ناومان هەبێ**

هەر وەها «مؤید طیب» باسی مرۆڤ‌و تـەیارەو ویسکی و ئـازار دەکات‌و دەبێژێت:ـ
**«ئەو مرۆڤێ پێ‌خو دانایە سەر هەیڤێ**[٤٤]
**هەر ئەوە بێ ل کیشوەرا رەش**
**تێتە کرین‌و فروتن**
**ئەو مرۆڤی لە سەر عەورا «ویسکی» ڤەدخوت**
**هەر ئەوە بێ ل جەرکێ ئاسیا قامچیا دخوت»**

«لطيف هەڵمەت»ی شاعیر باسی سانتیاگۆ و نیرۆدا بەم وێنە دەکات:ـ

**«گشت شاعیرە هەژارەکانی جیهان[45]**
**کۆبوونەوەو پەنجەی خۆیانیان بڕیو**
**لە سەر هەموو...**
**ئەستێرە چاوشینەکانی «سانتیاگۆ»دا**
**بەگڕی خوێن نووسیان..**
**لاوانەوەی نیرودا»**

«شێخ حەسیبی» شاعیر باسی ئەلەندی، و لومۆمباو قازی بەم شکلە دەکات:

**هۆ... ئەلەندی، هۆ لۆمۆمبا[46]**
**وا شێخ موجیب بەرماڵی خوێن**
**بۆ چوار چرای قازی ئەبا..»**

هەر وەها، «صلاح شوان» ی شاعیر باسی «ژان دارك» ئەکاو خوێنی ئەخواتەوە و سەر خۆش دەبێت.

**«دڵدارەکەم...![47]**
**لە سێبەری چاوەکانتا**
**غەمی دوای مردنی «ژان دارك» م نۆش ئەکرد**
**لە دارستانی پۆلیفیای قژی تۆدا**
**چەندەها شەو.. تا بەیانی**
**ئاگرم بۆ شەوی نەخەوتن خۆش ئەکرد».**

یان وەك «عبدالله عباس» ی شاعیر باسی شیلی دەکات و وەڵێت:

**«کە لێزمەی بارانی شیعرەکانت**
**رژایە سەر خاکی «شیلی»و[48]**
**خۆی گەیاندە رەگو ریشەی چەوساوەکان»**

بەم وێنەیە و بە گەلێك وێنەکانی تر شاعیری ئیمڕۆی کوردمان سوود لە کەلەپووری جیهانی وەرەگرێت وەك رووداوەکانی زانستی و هونەری و ئەدەبی و باسەکە گەلێك دوور و درێژتر دەبێت ئەگەر زیاتر پێدا بچینەوە.

## پەراوێزەکان:

١ ـ مجلة «الأدب المعاصر» ع ٢٧ «کانونی دووەم ١٩٧٨ سالی شەشەم.
٢ ـ مجلة «آفاق عربية» ع ٧ آذار ١٩٨٤ سالی نەهەم
٣ ـ مجلة «الدوحه» ع ٧٠ سالی شەشەم اکتوبر ١٩٨١.
٤ ـ بوشه: زۆرە بو ئاو بە کار دێت
٥ ـ کاروانی شیعری نوێی کوردی «کاکەی فەلاح» ص ٢٥.
٦ ـ دیوان «مؤید طیب» دەست خەتە ص ٤.
٧ ـ دیوانی «شەو نی‌یە خەوتان پێوە نەبینم» عبدللە پەشێو ص ٢٤
٨ ـ دیوانی «ئەمین» فەیسەل مستەفا» ص ٦١.
٩ ـ دیوانی «شەوانی تەنیایی» «سەعدواللە پەرۆش» ص ٩
١٠ ـ دیوانی «دووسرودی کێوی» «شیرکو بێکەس» ص ٦٩
١١ ـ مجلة «نوسەری نوێ» ع «٥»
١٢ ـ دیوانی «ژ ئەڤینا چرایێن کەڤن «عبدالرحمن مزوری» ص ٧٩
١٣ ـ دیوانی «مؤید طیب» ص ١٨
١٤ ـ دیوانی «گەردەلوولی سپی» «لەتێف هەڵمەت» ص ٣٧.
١٥ ـ نەوزاد رەفعەت «نوسەری نوێ» ع ٥.
١٦ ـ دیوانی «یا من گوتی‌و نەگوتی» «تێلی ئەمین»» ص ٩٧.
١٧ ـ دیوانی «شەوارە» «موحسین ئاوارە» ص ٣٥.
١٨ ـ دیوانی «سێ سیمفونیەو شەش سرود» «عبدالله عباس» ص ٢٨.
١٩ ـ دیوانی «ژوان» «حەمەی حەمە باقی» ص ١١٦.
٢٠ ـ دیوانی «بەرەو لوتکەی ئاوات» خالد, دلێر» ص ٩٠
٢١ ـ دیوانی «مؤید طیب» ص ١٢.
٢٢ ـ «کاروانی شیعری نوێ» «کاکەی فەلاح» ص ١٠٦
٢٣ ـ دیوانی «مؤید طیب» ص ٤٥.
٢٤ ـ دیوانی «بەرەو لوتکەی ئاوات» «خالد دلێر» ص ٧٢
٢٥ ـ دیوانی «عبدالرحمن مزوری» «ژ ئەڤینا چرایێن کەڤن» ص ١٧
٢٦ ـ دیوانی «مؤید طیب» ص ٣٩.
٢٧ ـ دیوانی «ژ ئەڤینا چرایێن کەڤن» «عبدالرحمن مزوری» ص ٨٣
٢٨ ـ «خەرمانی وشە» ص ١٢.
٢٩ ـ دیوانی «شین‌و شادی» «صبری بۆتانی» ص ٥٧.
٣٠ ـ دیوانی «گەردەلولی سپی» «لەتیف هەڵمەت» ص ٥٢.
٣١ ـ دیوانی «زریان» «أنور قادر جاف» ص ٦٨.
٣٢ ـ دیوانی «ژ ئەڤینا چرایێن کەڤن» «عبدالرحمن مزوری ص ١٠٤

٣٣ ـ ديوانی «بنەوشەکانی» «عبدالرزاق بیمار» ص ٥٨.
٣٤ ـ ديوانی «يا من گوتیو نه گوتی» تێلی ئەمین» ص ١٧.
٣٥ ـ ديوانی «فەرهەنگی خەم» «حەسيب قەرەداغی» ص ٦٠.
٣٦ ـ ديوانی «دلْدارەکەم» «صلاح شوان» ص ١٢٣.
٣٧ ـ ديوانی «زريان» أنور قادر جاف» ص ٧٥
٣٨ ـ ديوانی «نالەی جودايی» «هێمن» ص ١٨.
٣٩ ـ ديوانی «دلْدارەکەم» «صلاح شوان» ص ٥٧.
٤٠ ـ ديوانی «ژوان» «حەمەی حەمه باقی» ص ٧٣.
٤١ ـ ديوانی «ژ ئەڤينا چراێین کەڤن» «عبدالرحمن مزوری» ص ١٠٥.
٤٢ ـ ديوانی «دونيا فەرشی جەربەزەيە» «حەمه دەمین پێنجوينی» ص ٤٨.
٤٣ ـ خەرمانی وشه ص ٣٧.
٤٤ ـ ديوانی «مؤيد طيب» ص ٤٧.
٤٥ ـ ديوانی «گەردەلولی سپی» «لەتيف هەڵمەت» ص ٢٨.
٤٦ ـ ديوانی «فەرهەنگی خەم» «حەسيب قەرەداغی» ص ٥٦.
٤٧ ـ ديوانی «دلْدارەکەم» «صلاح شوان»
٤٨ ـ ديوانی «سێ سیمۆفونیەو شەش سروود» «عبدالله عباس ص ٤٢.

## سەرچاوەکان:

العربية:ـ ١ ـ اتجاهات الشعر العربي المعاصر ـ الدكتور إحسان عباس ـ عالم المعرفه ـ كوێت شباط ١٩٧٨.
٢ ـ دراسات في الشعر العربي المعاصر ـ شوقي ضيف ـ دار المعارف مصر الطبعه السادسه ١٩٧٦.
٣ ـ تطور الشعر العربي الحديث في العراق ـ د. علي عباس علوان ـ منشورات وزارة الاعلام ١٩٧٥ بغداد.
٤ ـ ثورة الشعر الحديث جـ ١ ـ دكتور عبدالغفار مكاوی الهيئه المصريه العامه للكتاب القاهره ١٩٧٢.
٥ ـ الأسطورەو الرمز ـ ترجمة جبرا ابراهيم جبرا ـ مبادئ نقدية وتطبيقات منشورات وزارة الاعلام بغداد ١٩٧٣.
٦ ـ الشعر العربي المعاصر ـ الدكتور عز الدين اسماعيل ١٩٨١ القاهرة.
٧ ـ الشعر الحديث الى أين ـ غالی شكری ـ دار الأفاق ١٩٧٧.

● هەندێ جار ریپۆرتاژی تێرو تەسەل کە مەبەستێکی رۆشنبیری لەدواوەبێ‌و، بابەتێک یان مەسەلەیەکی ئەدەبی دیاریکراو بەقووڵی یەکالابکاتەوەو بیخاتە سەر کاغەز.. یان مێزی لێکۆڵینەوە، لام وایە ئەم جۆرە ریپۆرتاژانە گەلێ دەرگای داخراومان لێ‌دەکەنەوەو، زۆر سووچی تاریک یان لەبیرکراو رووناک دەکەنەوە، ئەمەش هۆیەکی سەرەکی‌ی دەبێ بۆ شڵەقاندنی گۆمی مەنگ‌گرتووی باری رۆشنبیری‌و، زۆر قەڵەمی بڵێین «بێ‌تاقەت» یش دەبزوێنی، لەوانەشە هەر لەم گفتوگۆیانەوە سەری زۆر مەسەلەو بابەتی رۆشنبیری گرنگ وەدەرکەون‌و مەیدانی تر بۆ دەوڵەمەندکردنی رۆشنبیری کوردیمان بکرێتەوە.

# سەعاتێك زیاتر لەگەڵ مامۆستا سعید یحییٰ خطاط

عبدالوهاب تاڵەبانی

● ئینجا نازانم تا چ رادەیەك ریپۆرتاژی رۆشنبیری کوردی‌ی توانیویەتی خۆی لەئاستی ئەو جۆرە ریپۆرتاژانە بدات کە گۆڤارە ئەدەبی‌یە هەرە گەورەکانی دونیا خۆیانی پێیەوە خەریك دەکەن...

# کۆنگرەی قاهیرەو

# کاروباری

# ناوچەکانی کورد

■ د. ئەحمەد عوسمان بەکر ■

لە دوای کۆتایی شەڕی یەکەمی جیهانیدا، کار بەدەستانی ئینگلیز پاش تەجرەبەو ڕووداوی دوسێ ساڵێك هاتنە سەر ئەو باوەرەکە وا پێویستە کۆنگرەییك بۆ لێپرسراوانی بەریتانی دەربارەی گیرو گرفتەکانی ڕۆژ هەلاتی ناوەڕاستدا ببەسترێت. بۆ ئەم مەبەسە شاری قاهیرەی میسر هەلبژێردرا بە پێش نیاری مستەر وینستون چەرچل وەزیری وولاتانی ژێر دەست (COLONIAL OFFICE)ی بەریتانی کۆنگرەکە لە نێوان (١٢ تا ٣٠)ی مارتی ساڵی ١٩٢١دا بەسترا.

ئەم باسەی ئێمە دامەزراوە لە سەر ئەو راپۆرتانەی کە ڕۆژ بە ڕۆژ لە دەوری کۆبونەوەکانی کۆنگرەکەدا نوسراون و لە بارەگای گشتی وەسائیقی بەریتانیادا پارێزراون بەشێکی ئەم بەلگەنامانە لە ژێر ئەم ناوو ژمارەیەدان (وەزارەتي دەرەوە) (٣٧١) (٦٣٤٣) (٤٨٤٢) (ڕاپورت لە سەر کۆنگرەی قاهیرە).[١]

پاش بەندی ئەم راپورتە دەربارەی کوردستان ژمارە (١٠) دەیە کە لە ڕۆژی ١٥ مارتی ١٩٢١دا تومار کراوە.

لە راپورتی ناوبراودا بەشێك لە دەقەکەی بەم جۆرەی خوارەوە یە:

لەم کاتانەدا رووم لەماموّستا سعید یحییٰ خطاط کرد، بوّئەوەی ئەم گفتوگوّیەی لەگەڵدا بکەم، ئەوەشم لەبیربوو کە هەر ماوەیەك لەمەوبەر بەعەرەبی لەروّژنامەی «الثورە»دا گفتوگوّیەکی دیکەم لەگەڵیا کردبوو، ئینجا بوّئەوەی ئەو مەسەلانەی لەولا بلاّوکرابوونەوە لیّرە دووبارە نەبنەوەو، بەو حیسابەش کەلیّرەدا تەنها بوّ خویّنەری کورد دەدویّین. بوّیە نەخشەیەکی جیّاوازم بوّ پرسیارەکانم دانا..

● لە دڵنیابوو، داوای ئەوەی لیّبکەم، «سەرجەلەکەی» خوّیم بوّ بخویّنیّتەوە... کە ئەمەش یەکەم شتە روّژنامەنووس بیری لیّدەکاتەوە.. بەلاّم کاتیّ دیّتەوە هوّشی خوّی بازیِ بەسەردا دەواو، زیرەکانە سەری مەبەستەی بوّی هاتوە دەگریّتە دەستو دەست دەکاتە گفتوگوّکەی...

لەگەرمەی ئەم بگرەوبەردەیەدا کە خوّم لەگەڵ خوّمدا وەمکرد.. ئەو پیّی وتم:

- زوّر بیری لیّمەکەرەوەو واز لەو پرسیارانە بیّنە کە لەستارەکانی سینەما دەکریّن !.

چاکە، ئیّستا دەتوانم پشت بەو مەعلووماتانە ببەستم کەلەلای خوّم هەن و، ماموّستا سعید یحییٰ خطاط پیّشکەش بەخویّنەری ئازیز بکەم..

ئەم ماموّستایە خویّندەواریّکی هەرە باشەو زوّری لەروّشنبیری هەڵکڕاندوە، ژیانی تاقیِ کردوّتەوە. لەسەرخوّو هیّمنە..

کە پرسیاری لیّدەکەی بەگەرمی، ئاشکراو راستی وەلاّمت دەداتەوە..

حاڵی حازر جگە لە وەزیفەکەی لە ئەمینداریّتی روّشنبیری‌و لاوان، سەروّکی یەکیّتی ئەدیبان‌و نووسەرانی کوردە ـ لقی هەولیّر، ئەندامی دەستەی بەریّوەبەری نەقابەی روّژنامەنووسانە ـ لقی کوردستان ـ لە ساڵی دامەزراندی‌یەوە لە١٩٨٢ وتا ئیّستا.

پاش خواردنەوەی دوو پیاڵە چای رووم تیّکرد...

● ئیّستا بە چ مەشغووڵی ؟

● پاش ئەوەی داستانیّکیّ کەڵە نووسەری تورك «عزیز نەسین»م وەرگیّرایە سەر زمانی کوردی‌و دەزگای روّشنبیری‌و بلاّوکردنەوەی کوردی «بەکوڵیّ سوپاسمەوە» لە چاپدانی داستانەکەی گرتە ئەستوّو هیواداریم بەم زووانەدا

بکەوێتە بازاڕەوە.. ئێستاکێ هەندێ لە کورتە چیرۆکەکانی هەمان نووسەرم لە بەر دەستایە.. لە گەڵێ بەرگ‌و کتێبی جۆراو جۆردا هەڵبژاردوون.

وا بزانم هەمووتان «عزیز نەسین» دەناسن. خاوەن قەڵەمێکی تایبەتی گاڵتە جاڕی‌یە. لە ژێر پەردەی گاڵتەو پێکەنیندا، دەردەسەری‌ی کۆمەڵ‌و ئێش و ئازاری حەشار داوە.

هەروەها، بەردەوامم لە بلاوکردنەوەی ئەو ستوونەی رۆژنامەی «هاوکاری» رێگەی داوم بە شێوەیەکی رێکوپێکی هەفتانە سەر هەڵێنم.. جارو بار نەبێ، لە بەر چەند هۆیەکی تایبەت، کە پێوەندی‌ی بە خۆمەوەیە، لە بلاوکردنەوە دووا دەکەوم،..

باوەڕ بکە، ئەو هەفتەیەی لە گەڵ خوێنەرەوە بە یەك ناگەین، پەست‌و دڵگیر دەبم.. بەلام «قسەی خۆمان بێ» هەر ئەوەندەم لە دەست دێن ! بەرهەمی دیکەیشم هەن‌و خەریکی پێداچوونەوەو پاکنووسیانم.. ئەمە خوایە، بەڵکو بەم زووانە دەرفەتم بۆ هەڵکەوێ‌و توواناى لە چاپدانیانم هەبێ.

● باشە بۆ «عزیز نەسین» ؟

● من بۆخۆم حەز بەو ئەدەبە دەکەم‌تێ‌ی بگەم.. پاشان ئەو کەسانەی ئەو هەڵیان دەبژێری‌و دەیانخاتە نێو چیرۆکەکانیەوە شێوەیان لەو کەسانەی لای خۆمان دەکەن، کە رۆژ نیە لە بازارو دایەرەو چایخانەو شەقامدا چاومان پێ نەکەون.. مرۆڤی ساوێلکەو دڵساف‌و فێڵبازو ساختەچی‌و قوڵبڕو چاوچنوك‌و ویژدان سز، بگرە هەر لە مووچەخۆرو کاسبکارو دزو جەردەو بازرگانی تا دەگاتە فەرمانبەری گەورەو کاربەدەسێ دەوڵەت.. ئەمانە، پاڵەوان‌و ڕم بە دەسێ نێو حیکایەتەکانی ئەون..ئینجا خاوەن زمانێکی رەوانە.. زمانی گوندو شارۆچکەو خەڵکی سادەو ساکار.. بۆ هەموانی دەنووسێ‌و هەموو لێ‌ی تێ دەگەن. پێم وایە ئەم جۆرە زمانە سووك‌و ئاسانە لە هی تر زیاتر خزمەتی مەبەستەکانی ئەو دەکەن..

● ئەوەی لە تۆمان زانیوە، ئەمەیە کە گرنگی و بایەخ بە گەلێ لایەنی نوسینکاری‌و هونەری دەدەی.. وەرگێران‌و لێکۆلینەوەی رۆژنامەنووسی‌و نیگارکێشان‌و خۆشنووسی.. دەڵێن ئامێرێکی مۆزیقاش دەژەنی.. ئایا هەوڵت نەداوە، بە یەك لایەنەوە، خەریك بی ؟

● لێتی ناشارمەوە..هەموو ئەو لایەنە هونەری‌و ئەدەبی‌یانەی باست کردن لە خۆمەوەو بێ ئەوەی کەس دەستم بگرێ، فێریان بووم. ناڵێم هەندێ کەس پیاوەتیان لە سەرم نیە..بێ ئەمەکی‌یە پشت گوێیان بخەم، بەلام بە شێوەیەکی

گشتی، من خۆم بۆ خۆم گەلێ شت فێر بووم.. هەندێ جار ئارەزووم کردووە، بگرە هەوڵیشم داوە.. وابووە بە ساڵ و بە مانگ، لایەنێکم وەلاوە ناوە..بەلام دووای ئەم کاتە درێژە لە پڕ گەڕاومەوەتە سەری.. بۆ ؟ چونکێ بۆم دەرکەوت ناتوانم دەست بەرداریان بم و وەك پارچەیەکی دڵم بی، تۆ بڵێی کەسی وا هەبێ، لە دڵی خۆی بێزار بێ ؟

شاعیرێکی غەیرەی خۆمان، لە دێڕە شیعرێکدا لەم بارەیەوە هەست دەردەبڕێ و پێی وایە، ئەدیب و هونەروەر، پێویستی یان بە دوو ژیان هەیە. یەکێکیان، بۆ ئەوە بێ، لە تاقیکردنەوەو ئەزموونی دا قاڵ بێتەوەو ژیانی دووەمیش، بۆ ئەوەبێ، ئەوەی فێریان بووە، لە داهێنان و ووردەکاریدا بە کاریان بێنێ.. ناوە ناوە کە ئەمەم وەبیر دێنەوە، لە دڵی خۆمدا دەڵێم: دەبێ من پێویستیم بە چەند دانە ژیان هەبێ ؟

ئەگەر پرسیاریشم لێ دەکەی و دەفەرمووی: ئاخۆ ڕازیی بەوەی فێریان بووی ؟ ڕەنگە بوێرم و بڵێم: بەڵێ ! لە یەك تاقە ژیانداو ماوەیەکی کورت، ئەو قۆناغەی کەسانێك لە هەموو ژیانیاندا نایبڕن، من ڕەتم کردووە.. لە خۆبایی نەبێ، هەروەها دەبێ: ئەوەی تێی گەیشتبم، لە نیگارکێشاندا شیعر دەدۆزمەوە.. بۆنی چیرۆك لە مۆزیکدا دەکەم.. هەر وەختە بڵێم: نووسەری سەرکەوتوو، پێویستی بەوە هەیە، لە هونەرو ووردەکاریدا دەست و پێ سپی نەبێ.

● بێینە سەر هەڵسەنگاندن و باری ڕۆشنبیری.. ڕەخنەو ڕەخنەکاری چۆن دەبینی و لە ئەدەبیاتی کوردی دا چۆن جێگەی دەکەیتەوەو لە کوێی دادەنێی ؟

● ڕجا دەکەم بە سالۆس و قوماربازم نەزانی.وا تخووبی ترس و لەرز دەبەزێنم و ڕای خۆمت بەو پەڕی سەربەستی، پێ دەڵێم..

ڕەخنەو ڕەخنەکاری ئەم زەمانم وەك ئابڕووبردن دێتە بەر چاو.. یا وەك پەڕۆ باڵ دەرهێنان و ڕووت کردنەوە.. هەندێ کەس، بەو ناوەی ڕەخنە دەگرن، چۆن منداڵ چۆلەکەی وەگیرکەوێ و سەری هەڵکێشی، وا ڕەفتار دەکەڵ بەرهەم دەکا. هەموو ئەو ڕچکۆڵانەی ئەوان گرتوویانە بەرو لە سەری دەڕۆن، لە چەشنی گەردەلوول بە قوژبن و گۆشەی بەرژەوەندی ی خۆیانیان دا دەدا..

کابرایەکی سەر بە تایەفەو قەبیلە، لە ڕوانگەی بەرژەوەندی ی هۆزەکەیەوە، مامەڵە لە گەڵ خەڵکی بیانی و دەرەوەی خۆی دەکا.. یەکێك پشکی کۆمپانیایەکی بەرهەم هێنەری تایەی ئۆتۆمبیل بکرێ بە پێی وەزعی تایبەتی ی خۆی و حیسابی قازانج و زیان، دەبێتە جاڕدەری ئەو کاڵایە.

لای غەیرە، ڕەخنەکاری‌و هەڵسەنگاندن، قوتابخانەیەو لە سەر بناغەی بتەوی، هەندێ زانستی‌ی کۆمەڵ وەستاوە.. هەر لە جۆری ژیان، تا دەگاتە باری ڕۆشنبیری و ئابووری و چۆنیەتی‌ی دەس بە سەر داگرتنە سەر بەرهەم‌و سەرچاوەکانی.

لای ئێمە، ئەوەی پێ‌ی بێژن «ڕەخنە» لە شەڕە دەنووك‌و نوخان ناترازێ. نینۆکی وا تیژ، جاری وا هەیە، پێست زامدار دەکاو برینەکەی دەگاتە سەر ئێسقان.. وەك تا ئەمڕۆ نە نینووك برمان ببینبێ‌و نە لە بازاڕەکانماندا بفرۆشرێ.

ئەمە ئەوە ناگەیێنێ کە ئێمە کۆمەڵێکی دوواکەوتووین‌و ڕەچاوی وتنمان لێ ناکرێ.. نا.. ئەمە تەنیا بۆ ئەوەیە، کە هۆیە بەجێیەکانی پێشکە نەخۆشی‌یەکانمان دەست نیشان بکەین‌و لە تەوقی تایەفەگەری‌و تاقم‌و خێوەت هەڵدان، ڕزگار بین.

بە پێ‌ی زانستی‌ی شارستانیەت‌و پێشکەوتن.. ئێمە هاین، لە گوندێکی فرە بچووك.. خەڵکێکی کەم ژمارەو نە گۆڕاو.. هەر هەمان دەم‌و چاوو هەمان لووتی هەستی بینیان نەماوە..

کەسێکی ئەم دێیە بە زەحمەتی نازانێ‌و وەك ئاو خواردنەوەوایە، ووردە ڕازی ژیانی ڕۆژانەی دانیشتووانی بزانێ.. تەنانەت قسەو سوحبەتی یارانیش لە جێ ژوانانداا.

لە هەندێ ناوچەو دێ‌ی کوردستان، کانی‌و بڕو دەستاو هەن.. پەرژینێکی لە گونیەو تەنەکە، یا لە لق‌و پۆپی درەختیان وەدەوردا وەریناوە. ئافرەت‌و کچی جحێڵی گوندی، بێ کۆدەبنەوەو بە هەنجەتی دەست نوێژو بسمیل‌و غوسل دەرکردن، وەختی لێ دەکوژن‌و کاتی لێ دەبەنە سەر.. باسی ئەم‌و ئەو دەکەن‌و پەڕووی گلاوو پیسی ئەوان دەدەنە تیشکی خۆر.. ئەو ئافرەتانە ئێزگەیەکی گەڕۆك و نا شەرعی‌ی ناوچەن.. لە دەنگوباس‌و کورتەی هەواڵە ـ کانیاندا، باسی حەز لێکردن‌و خیانەت دەکەن. خیانەتکاری‌ی مێردو ژن‌و حەز حەزۆکێ‌ی کوڕگەل‌و گیژوکاڵ.

کۆمەڵگەیەکی وا تەسك‌و خەڵکێکی وا، چۆن ڕەخنەکاری دەعاملێنن‌و مامەڵە لە گەڵ کەسانی دەوروبەریان دەکەن ؟

تا چەند ساڵێکی بەر لە ئێستا.. چاپەمەنی‌یەکانی کوردەواری خۆمان، نووسەرێکی خۆیان تەرخان دەکرد، بڵاوکراوەو بەرهەمە نوێکان هەڵسەنگێنێ. هەر لە قەوارەو ژمارەی لاپەڕەو ناوی چاپخانەو ئەوەی هەڵەی زمانی لێ بژار کردوون.. کارەکە خۆی لە خۆیەوە بۆ پارەو دراو بوو. کەسانێ وایان دا دەنا، کە

ئەمەیە رەخنە.. لە کاتێکدا کە لە چوارچێوەی مەتح و پیاهەڵدان و شان تەکاندن تێپەڕ نەدەبوو.

باشە نەبوونی و قاتی ڕەخنە، مانای ئەوەنیە کە ڕەخنەگرمان نیە ؟ ئاخۆ وایە، ئەمانە بۆیە نین، چونکە بەرهەمی وا، نەهاتۆتە کایەوە شایـانی زەحمەت کێشانی ئەوان بن ؟

من بە ڕاستی نازانم بەو هەنجەتە خۆیان دوورە پەرێز بگرن.. ڕاستیش نیە، تەنیا لە روویەکی ڕەخنەکاری بگەن. کە وەك تەختەیەکی بازنەیی بە هێلی ڕەش و سپی نەخشێنراو بۆمان هەیە تیری تێبگرین و ئەگەر نیشانەمـان پیکا، خۆیەتی و ئەگەر نا، وەکو سەرەندو بێژنگ کون کون بکرێ..چ مەبەست !

پێم وایە کاتی ئەوە هاتووە، جێ پێ ی هەڵبەست لەق بێ و ماوەی چیرۆك و لێکۆڵینەوەی زانستی و مێژوویی بدا ..یا هەر نەبێ وەکو ئەوان، یا کەمتر، خۆیان لە بان لاپەڕەکانی چاپەمەنی و بڵاوکراوەکاندا بدۆزنەوە.

ئەم بارە بە رەخنەگر ساز دەکـرێ.. لەم بڕوایـە دام، ئەم دەرفـەتە لە بەرژەوەندی ی هەموو شێوە ئەدەبیەکاندایە و شیعریش دەگرێتەوە. چونکە ئەو شیعرەی نەتوانێ شوێنە سەختەکان بجووڵێنێ و هەست بزوێن نەبێ و بـەرەو کردەوە هان نەدا.. ئەو شاعیرەی قسە نەزانێ.. شیعرەکە لە بـازنەی بـەتاڵ وێنەی بیهۆودە و سادە، دەخولێتەوەو ئەو شاعیرەیش خەڵکی ئەم سەردەمەی خۆمان نیەو دەبوو لە دێر زەمانەوە چاو هەڵێنی و خولی ژیان تەواو بکا.

برا شاعیرەکانم لێ زویر نەبن و ئەوەی دەیڵێم قسەیە.. مەرجیش نیـە، قسەوا بە رووت و قووتی وەربگیرێ..

کێ لە شاعیر راستگۆترە، ئەو کاتەی خوێنی خۆی دەسووتێنێ و خوێن لە شادەمارەکانی بەردەدا، هەر بۆ ئەوەی هەڵبەستێکی لێ بکرێنێ ؟ کێ لە شاعیر درۆزنترە، ئەو کاتەی لە چۆڵ و بیابانێکی ووشك و بێ ئاودا، درەختە گـوێزێـك دەڕوێنێ و داوامـان لێ دەکـا، لە ژێـر سێبـەری ئـەو درەختـە مـانـدوومـان بحەسێنینەوە ؟

لە مەیانی درۆو ڕاستیدا، باریکە موویەکی بە چاو نەبینراوە.. لە رەخنەگر بترازێ کەسێکی دیکە بە چاوی بێ زەرەبین نایبینێ.. هەر ئەوە، دەتوانێ دووبارە خانووچکۆڵەی منداڵانە بڕوخێنێ و دووبارە، لە سەر تەرزو شێوەی نوێسازیدا بینای بکاتەوە..

لاپەڕە ڕۆشنبیری‌یەکانی نێو ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردی‌یەکان، هەر وەختە ئاش بەتاڵی لێ بکەن. بە دەگمەن ڕەخنەی لێ بلاوەبنەوە، بەو جۆرەی سەرنجی خوێنەر ڕابکێشن و بیجوولێنن.. ئەو کاتە بەسەر چوو، کە قەڵەم خاوەنی دەمو نووکێکی وەك چەقۆ، نیژ بوو. ئەم قەڵەمانە ئێستاکێ کەوتوونەتە بەر تەرمی مێژوو.. دەمیان ناوەتە کەلەپوورو فۆلکلۆر.. هەر بۆ ئەویستی نەکەس ناویان بەرێو نە ناوی کەس چ بە چاك و چ بە خەراپ بەرن. وەك چۆن دەولەتان پارێزگاری لە بەرژەوەندی خۆیان دەکەن و لە ئاست سەرپێچی کردن لە بڕیارەکانی ڕێکخراوی دەولەتە یەکگرتووەکانەوە مات و بێ‌دەنگ دەبن.

دەوڵەتێکی گەورەو زەبر بە دەست، کە بالیۆزخانەی لە پایتەختێکی ڕۆژ هەلاتدا دەتەقێنن و دەنگ ناکا، نەبادا بە جواو هاتنی ببێتە هۆی تێکچوونی باری ئاشتی‌ی جیهان..

ئەمە جیاوازە لە گەڵ بێ دەنگی، لە ڕاست ئەو قەلەمانەی شتی وا دەنووسن، زیانی بێ‌وکەسیش وورتەی لێوە نێ ! بە پێچەوانەی جیهانی خۆمان، دنیای بیرو ئەدەبیات، ناوە ناوە، پێویستی‌یان بە نەبەردو بگرە شەڕی سەرتاسەریش هەیە.

چ شتێ گەورەو ناهەموار ترە، لەوەی قەڵەم کوڵ بێ، یا ژەنگ بگرێ ؟ چ شتێ زیانی زیاترە، لەوەی نووسەرو ئەدیب و هونەرمەند، ڕەقیب و ڕەخنەگریان نەبێ ؟ ئەوکاتەی نووسەر بێ خەم و خەیال لێی بنوێ‌وکەسێ نەبێ بە دۆیەکەی بلێ ترشە، ئەوە دەستی لێ بشۆرە.. بیەوێ‌و نەیەوێ، بەرەو مردن هەنگاو دەنێ.. مردنێ بەرهەم‌و داهێنان‌و ووردەکاری.

بە پێی بۆچوونی خۆم، ئەوانەی سەرپەرشتی‌ی لاپەڕە ڕۆشنبیری‌یەکان دەکەن، هۆی ئابلۆقەدانی ڕەخنەو قەدەغە کردنی هاتوچۆ، دەخەنە پاڵ ئەوەی، نەبادا هەندێ کەس دەستکەنە شمشێرو کەسانی دیکەی پێ هەڵپاچن و بیان تۆقێنن‌و لەت لە تیان بکەن ! ئەمە ستەمە دەرهەق ڕەخنەی دەکەن. وەك دێوێك وایە بچووکی بکەیتەوەو لە ناو شووشەیەکی تەسکدا تەپەدۆری لێ قایم بکەی.. ئەمە فیزو گاڵتە پێکردنە وەنووسەری دەکەن‌و لە بەهرەو تووانای کەم دەکەنەوە.

من بۆ خۆم ئەوەی ترس‌و گومان بێ، لەم کارەی نابینم.. با دەستەو کۆمەڵێك هەبن، هەندێ شت بلێن، بەلام لە چوار چێوەی سنووری ئەخلاق‌و پەروەردەی کۆمەلایەتی.. قەی چی ئەکا، ناوە ناوە، ئەوانە چەند مەترێ درکە

ئاسن وتوو ترك‌و تخووب ڕەت بکەن ؟ ئەگەر زیانی کۆمەڵیان نەبێ‌و ئەوەی ڕەخنەی لێ دەگرن لە قنارەی نەدەن‌و پێستی هەڵنەواسن ؟!

دیارە مەسەلە، وا نیە.. مەسەلە ئەو دابڕانەیە، کە نووسەران، تێ ی کەوتوون. هەر چەترەو خێوەتە، چەند کەسێکی لە ژێر سێبەری خۆی حواندوتەوە، بە تایبەت، ئەوانەی دۆست‌و برادەری ئەو نووسەرانن کە سەرپەرشتی ی لاپەڕەکان دەکەن.

بەم حاڵە، هەندێ ڕەخنەگر، قەڵەم‌و کاغەزیان پێچایەوەو خەستیاننە نێو جانتای دەست‌و بەتەڕدەستی گوڕەپانیان جێ هێشت.. ئەنجام بە چی گەیشت ؟

سەدان لە نگەری ی پڕ لە هەڵبەستی ئامادەکراوە سەرپێ یی‌و چیرۆکی لاوازو ناوەرۆك پووچەڵ، خرانە سەر خوانچەو سفرەی خوێنەرانەوە، بێ ئەوەی بزەیی یان بەو خەڵکە بێ.. هەر بۆیە کەسانێ ژەهراوی بوون، زۆریش دڵیان خۆراك ناباو مانیان لە خواردن گرتووە.

لێرەدا ناکرێ، پرسیارێك نەکەین: چۆن لەم تۆڕە ئاڵۆزەدا نەجاتیمان دەبێ ؟

ئاشکریە کە قۆناغی ئێستا، گەلێ جیاوازە.. ئێستا شوکر دەزگا رۆشنبیری یەکانی بایەخ بە ئەدەبیاتی کوردی دەدەن، کەم نین، ئەم راستی یە ڕەخنەگر ناچار دەکا، کە لە ئەمڕۆ زووتر نیە، بەهەر ئامێرێکی گوازتنەوە بێ، خۆیان بگەیێننە مەیدان.. هاتنیان تا بڵێ ی زەروورو پێویستە.

● رات چیە دەربارەی ئەو کۆڕە «ئەدەبی» یانەی لە چایخانەکاندا دەبەسترێن ؟ لەو بڕوایە دای ئەو کۆڕانە تەوژمی داهێنانی لاوان بتەقێنێتەوە ؟

● هەر بوارێکی لاسایی دەگری، سەر ئەنجام زیانی خۆمانی تیابووە.. چایخانە ئەورووپایی یەکان، یا ئەوانەی پاریس، کە ئەدیب‌و نووسەرو هونەرمەندی لێ کۆ دەبوونەوەو بیروڕای تێدا ئاڵ‌و گۆڕ دەکران، یەك قوتابخانەو فێرگەیان دروست کرد، نەك هەر لە سنوورە تەسکەکەی فەڕەنسا، بگرە هەزاران فەرسەخی بڕی‌و کاری کردە سەر هەردوو جووڵانەوەی ئەدەبی‌و هونەری.

لای ئێمە، کۆڕو دانیشتن خاڵی نین لە نەخۆشی‌و دڵ پەستی تەگەرە.. باسی ئەم‌و ئەوی لێ دەکرێ.. بە ناوی نوێ خوازی‌و یاخی بوون، پیاوە ماقووڵ‌و ناودارەکانی خزمەتی گەلیان کردووە، بەر گوللە دەدرێن.. هەموو ئەوانەی شتێی دیاریان لە زمان و مێژووو شتی جێ هێشتووە، بە ووردیلەو لە ئەنجامی بە

یەکگەیشتن و جووت بوونی ژنێکی بێ ئابڕووو پیاوێکی ساختەچی، هاتۆتە کایەوە !

ئەم بۆچوونە، نەك هەر ترسناك و گومان لێ کراوە، بگرە خزمەتی ئەم گەلەو دووا ڕۆژی نەوەی ئێستا ناکەن. هەندێ داب‌ونەریتی نەتەوایەتی، یا کەلەپووری میللی، قەبووڵی ئەوە دەکەن، بۆ چوونیان لە سەر بنچینەیەکی هاوچەرخ بێ.. بەڵام ڕێگەی ئەوە نادەن لە ناوەڕۆکدا، بەتاڵ بکرێن. گوناهە لە ژێر بارێکی نا ئاسایی و لە بەر تیشکی جووڵانەوەو بیروڕای نامۆدا، هەرچی مێژوویی ئەم گەلە هەیە، خەتێکی بە سەردا بکێشین !!.

تا ئەو کاتەی کەڵە شاعیرمان لە نێو هەڵدەکەون، نالی و خانی و حاجی قادر، هەر گەورەو پایەبەرزن.. ئەو کەسەی داوامان لێ دەکا، هەرچی داب‌ونەریت هەن، وەلاوەیان نێین، وەك ئەو کەسە وایە، لە چرقەی گەرما، یا لە ساردوسوڕوو بەستەڵەکی زستاندا بەرگەکانمان داکەنێ !. ئەوەی پێی وایە، ئەو داب‌ونەریتە کەڵکی ئێمە نادەن و تەڵپی تەڕیان پێوە نەماوە، بە چەند لاتێکی بێ هۆش و سنگ کراوەی تووکاوی سەر شۆستەی شارە گەورەکانی ئەوروپا خەڵەتاوە.. چونکە نە ئێمەین تۆپ و فڕۆکەمان دروست کردبێ و نە ئێمەین شەڕو نەبەردی ئەستێرەکان بکەین.

بەر لە چەند مانگێکەوە، لە شوێنێکی دیکەدا، هەندێ قسەم کردن.. ئەو قسانەی من، تا ئێستا کەسانێکی تر نەیانکردووە (مەبەستم ئەدیب و نووسەرانی کوردە).. ئەوان باشتر لە هەڵوێستی خۆیان دەگەن و ئەمەیش مافێکی خۆیانە.. نەدەکرا چەند گۆشەیەکی تاریك ڕووناك نەکەمەوە.. نەدەکرا، باسی هەندێ شوێنەوار نەکەم، کە تا ئەمڕۆ، بەنی بەشەر پێی نەناوەتە سەر. ئەوەی هەق و ڕەق بوون !. بەڵام بۆ بکرێتە کراسەکەی «عثمان»؟

ئەوەی لێرەدا مەبەستمەو دووپاتی دەکەمەوە، ئەمەیە کە پێویستە ناوە ناوە دەرزی لە لەشی تەمەڵ و تەوەزەل قایم بکرێ. چونکە کارەسات لەوە گەورەتر نیە، نووسەر بە چاوی بەسترایەوە قسە هەڵبەستێ.. بەم حاڵە وای لێ دێ، کە بستێ لە بەر خۆ بەم لاوە هیچ نەبینێ.

● دەوری ئەدیب و ڕۆشنبیر، لە جیهانی سێیەمدا چۆن دەبینیو... رات بەرامبەر بە مردن چی یە ؟

● مردن، هەروەها رووت و قووت، بێ ئەوەی مانای فەلسەفی بدرێتێ.. کۆتایی هاتنی دروست‌کردن و داهێنانە.. دووا ئێزگەیە کە دەبێ ئادەمیزاد

بیبڕێ.. ئێزگەیەکی ژیانە، کە ئەوەی فیڵو فەرەجە سەر ناگرن‌و مرۆ ناچارە تێیدا، دابەزێ.. بەلام چۆن دابەزینی ؟ هەتا هەتایە.

ئەم بارەگایە بۆکەسانێ، خێرو بەرەکاتت بوون.. بۆهەندێکی دیکەیش لە کار کەوتن.. ئەوانەی لە تەمەنی لاوی‌و گەنجیدا، هەندێ بەرهەمیان داو نێویان دەرکرد، ڕەنگە ئەگەر مردن نەبوایە، ووردە ووردە دادەبەزین‌و ئەم ناوەی ئێستا هەیانە، نەیان دەبوو !.

شایەرو گۆرانی بێژی کورد، هەر دەیلێتەوە: «خۆرگە پیری دەبوو، بەلام مردن نەدەبوو». ئەمە خواست‌و ئارەزووری مرۆڤ دەردەبڕێ، نەمرو ژیاو بێ هەتا هەتایی.

مردن وەك ترازووی ڕێکخستنی کاروباری ئەم سەر زەمینەی خۆمان، کارێکی پێویستە. هەندێ لە زاناکان پێیان وایە، کە دووای چەند سالێکی دیکە، تەمەنی مرۆ، دە بە قەد ئەم تەمەنەی ئێستای، درێژ دەبێ. ئەگەر ڕاست‌و ئەگەر درۆ، پیاو دەتۆقێنێ ! بێگومان ئەو کاتە، تا بلێی شارستانیەت بێ روحم‌و بێ بەزەیی دەبێ !

لە لایەکی دیکەیشەوە، ژمارەی دانیشتووانی گێتی‌ی دووای سالی (٢٠٠٠) یەجگار بەرز دەبێتەوە.. بەرامبەر بەو کەمبوون‌و قاتی‌ی بەرهەمی کشتوکال، کە تا ئەم سەعاتە، ژیانی مرۆڤی پێوە بەندە.

ئەمە بە هۆی ئاوو هەواو خاك ڕوو دەدا، لە کاتێکدا کە ڕۆژ نیە، چەند دەمێکی تازە کرایەوە داوای خۆراك نەکەن..

هەندێ شتی تریش هەن، وەك دووا ڕۆژی پێوەندی‌ی کۆمەلایەتی.. بەلام مەسەلەی خۆراك، مەسەلەیەکە هەموو دانیشتووانی ئەم جیهانەی لێ هاوبەشن.

هەر چەندە چارەسەرکردنی، ئەم گیروگرفتە، لە تاقەت‌و دەسەلاتی نووسەر بەدەرە، بەلام وەك پێشڕەوو سەرکردەو مرۆڤێکی نا ئاسایی، دەبێ لە گەلێ شتی دەوروبەری خۆیەوە بگا. ئەی دەوری چ دەبێ ؟

لە شارستانیەتێکی دوورە خۆمانەوە، پێوەندی‌ی کۆمەلایەتی‌و مەسەلەی نێوان ئامێرو مرۆڤ، سەری هەلداوە. ئەم مرۆڤە ڕۆشنبیرە ژانەسەری چارەنووسی گرتووە. زەنگی ترس لێ دەداو هەولی ڕزگار بوونیەتی لە جۆرە پێوەندی‌یەکی جنجال و ئالۆز..

ئەو مرۆڤانەی لە کاتی خوێندا، سکیان بە بەرهەمی وولاتەکانی ژێر دەستەوە، تێر دەکرد، ئێستا خۆیان دەخۆن.. هەر بۆیە بووینەتە بەندەی ئامێرو ئەلەکترۆنی، کە بە دەستی خۆیانەوە، دروستیان کردوون.

ئەمەلە وولاتانی جیهانی سێیەمدا، بە گیروگرفت لە قەڵەم نادرێن.. هەر چەندەی هەندێ کەس هەوڵیان‌دا، هەمان کێشە لە بەرهەمەکانیاندا سەر هەڵدەن.. بەلام وەك مندالی «زۆڵ» تەماشای ئەو بەرهەمانە کران..

کەواتا ئەو گیروگرفتەی رۆشنبیرێکی رۆژئاوایی دووچاری بووە، وەك گیروگرفتەکەی رۆشنبیرێکی ئەم وولاتانەی خۆمانەوە، نیە..

لەم دووایی‌دا، هەندێ کەس داوای تەکنۆلۆژیای (نەرم) دەکەن.. داوای جۆرە پێوەندی‌یەکی مرۆڤانەی نێوان ئامێرو بەنی ئادەم دەکەن.

ئەوەی گوتم.. ئەم جیاوازیانەی باسم کردن، ئەوە ناگەینن، رۆشنبیرێکی وولاتێکی تازە پێ گەیشتوو، لە بەرامبەر مەترسی‌دا، دەست لە گونان درێژ ترِ بوەستێ !

چونکە ئەگەر هەولێ نەدا، دەکەوێتە دەرەوەی (شارەیاری).. تەنیا ژمارەیەك دەبێ لە سەر فایلی نێوجانتای خاوەن زەبرو دەسەلاتی سیاسی‌و پارەو دراو.

ئەو رۆژەی، رۆشنبیر دادگای بۆ دەولەتێکی دەست تێکەڵ کەری نێو کاروباری دەولەتێکی دیکەی ئاسیا، پێك هێناو جەنگی، بەشتێکی بلَحو دژ بە ژیانی مرۆڤ دایە قەلەم.. سەرمایەدارو شەڕ فرۆشەکان، گاڵتەیان پێ دەکردن.. هەمان هەلوێست سەبارەت بە داگیرکردنی «الجزائر».. کەچی پاش چەند سالێکەوە هەردوو دەولەت، ئاسیاو ئەفریقیایان جێ هێشت‌و سەرکەوتن نەسیبی رۆشنبیران بوو.

بەڕای منەوە، ئەوەی بیرو مێشکی رۆشنبیر دەگوشێ‌و ئالۆزی دەکا، ئەمەیە کە چۆن بتوانێ ترازووی لار بهێنێتەوە دۆخی جاران.

لە کیشوەری ڕەش‌دا «بۆ نموونە». برسێتی مرۆڤی ئەوێی هاڕی‌و خواردنی.. چەند ملیۆن کەس، کەوتنە ژێر رەحمەتی مردن. شاعیرێکی ئەو کیشوەرە بێت‌و شیعر بە دوو چاوی کاڵ هەلداو بیابانمالن وەك بەهەشت روباری هەنگوێن‌و شیری تیادا بڕۆن.. ئەو شاعیرە گەلێ‌لە «مسیلمە» درۆزنترە.

کابرایەکی لبنانی، ڕقی لە سەربازو جاندرمەی جوولەکە بێ، نەك لە بەر ئەوەی زایۆنیزم لە خۆیدا جوولانەوەیەکی ڕەگەز پەرستانەو فاشیزمە، بەلکو، لە

١ ـ ئەو رووداوانەی کە بوونەتە هـۆی دامەزرانـدنی کۆنگـرەکە و پـەیرەوی رەسمی بەڕێوە بردنیدا ئەمانەن:
أ ـ لە ١٤ شوباتی ١٩٢١دا ئەنجومـەنی وەزارەتی بەریتـانیا کـۆبووەوە بـۆ لێکۆڵینەوە لە سەر ئەو راپۆرتانەی کە لێژنە (کۆمیتە)ی رەسمی لە لایەن سەرۆک وەزیر دامەزرابوو بۆ ئەوەی پێش نیارو بیروڕا دەربڕێت بۆ بنیادنانی دەزگایێک لە وەزارەتی وولاتانی ژێر دەست (مستعمەرات) تا وەکو بتوانێت کاروباری ئـەم جۆرە وولاتانە لە رۆژ هەلاتی ناوەڕاستدا بەڕێوە ببات (بڕوانە پـاش بەنـدی یەك).[٣]
ئـەنجومـەنی وەزیران لە سـەر هێنـانـەدیی پێش نیـارەکـانی کـە لە راپۆرتەکەدا هاتووە بڕیاری دا.
ب ـ ...
ج ـ ...
لە هەمان کاتدا ئەنجومەنی وەزارەت بڕیاری دا کەوا وەزیری وولاتانی ژێر دەست (و. چەرچل) فەرمانی پێ بڕێت لەمانگی مارتدا سەر لە میسر بدات تا وەکو لەگەل کار بەدەستانی بەریتانی لە وولاتانی رۆژ هەلاتی ناوەراستدا بە پێی پێش نیارەکان گفتوگۆ بکات.

٢ ـ وەزیری ناوبراو بە خێرایی دەزگا رەسمیە ناو براوەکەی دامەزراند، پێش نیارێکی بەئەنجومەنی وەزیران پێش کەش کرد دەر بارەی پێویستی پێك هێنانی کۆنگرەییێك بۆ لێ کۆڵینەوەو لێکدانەوە لەسەر باری ئابووری و گیروگرفتەکانی رۆژ هەلاتی ناوەراست.
وەزیری ناوبراو شاری قاهیرەی بۆ ئەم مەبەستە هەلبژارد. بەم جۆرە بە خێرایی جێگاو شوێن رێك خرا بۆ ئەو کۆبـونەوەیـە و بۆ ئـوێنەرە بـەرزەکانی بـەریتانیو فـەرمانبـەرانی گشتی سوپـایی بەریتـانی لە فەلەستـینو وولاتی مێسۆپۆتامیاو ئێرانو تیمچە دوورگـەی عەرەبو حـاکمانی سـۆمالو عـەدەنو فەرمانبەرانی تر کە ئاگاداری کارو باری ناوچەکەن.
٣ ـ بەروکرا مێکی کاتی لە هەمان کاتدا لە لایەن دەزگای رۆژهەلاتی ناوەراسی ناو براودا پێش کەش کرا بۆ هەموو ئەم لایانەوەو برووسکە لێ دران. هەر وەها بیرو ڕای ئەنجومەنی وەزارەت لەم رووەوە لە وەزیری ناو براودا گەیێنرا پێش ئەوەی بۆ قاهیرە بەرێ بکەوێت، پاش ئەوەی ئەم بیرو رایانە لە گەل کار بەدەستانی شارەزا کە لە لەندەن بوون شی کرانەوە (پاش بەندی ٢).

بەر ئەوە بێ داگیرکردنی ئەوێ، بێ بەشی بکا لە قومارو ڕوڵێتی گازینۆکان لبنان، باشتر وایە، ئەو کەسە یەکسەر سواری کەشتی بێ‌و خۆی بگەیێنێتە هەندەران‌و لە گۆرەوی دەگری تا کراس‌و پانتۆڵ بگۆرێ.. تەنانەت ناوو نازوێکی دیکە بە خۆیەوە بلەکێنێ.

هەر کاتەی، هەر یەکێکی لە ئێمە دەگری، وا تێبگا نیشتمان بەردەستێیەوە حەز بکا لە جیاتی ئەو کبریت بەکاردێنێ‌و ئەو بە لاوە دەنێ، لە نیشتمان پەروەریدا کزو بێ بەشە..

نووسەرو ئەدیب وەك کوتاڵ فرۆش ماسی‌گرو بۆیەچی پێلاو نین.. دەبێ بزانن چۆن کەرەستەی هونەر لە خزمەت پێشکەوتن‌دا بەکاردێنێ‌و چۆن مەترسی بە دەوروبەری دوور دەکاتەوە. ڕۆشنبیر لە سەر یەتی، لایەنی نیشتمان بگرێ‌و هەر کاتی‌تی دووچاری مەترسی بوو، بەرگری لێوە بکاو بپارێزێ.

● بەو پێیەی، بایەخ بە وەرگێران دەدەی، تا چ ڕادەیەك وەگێری کورد توانیویەتی شێوەی ئەدەبێ کورد بەدەربخا ؟

● باری چاپەمەنی کوردی، ناشکوری نەبێ، ئێستای خاسترە لە چەند ساڵی لەمەو بەر کامە شۆستەی شەقامەکانی شارە کوردستانی یەکان دەگری، پێشانگەی کتێبن. ئەمە پێوەندی بە جێ بەجێ‌کردنی مافی نەتەوایەتی و ئۆتۆنۆمی‌یەوە هەیە. سەرەڕای ئەوەی کە هەندێ دەزگا بایەخ‌و گرنگی بڵاوکردنەوەو چاپەمەنی کوردی دەدەن.

لێرەدا، وەرگێڕان بەشێکی گرنگی لە جووڵانەوەی بڵاوکردنەوەو چاپ کردن‌دا هەیە. بەڵام کەسانێکی کەم‌ژمارە شاکاری ئەدەبیاتی گەلانی دیکەیان هێناوەتە سەر زمانی کوردی.. بۆ ؟ ئەوانەی زمانی بێگانەیان دەزانی بە پەنجەی دەست دەژمێردران. هەندێ نووسەریش هەن بە چاوێکی سووك تەماشای وەرگێڕان دەکەن ! پێیان وایە ئەو کارەی ئەوان خزمەتی دانەر دەکا.. ئەمەش لە ڕاستی‌یەوە دوورە.

من لە گەڵ ئەوەدا نیم لە عەرەبی‌یەوە شت بکرێنە کوردی.. لە گەڵ ئەوەدام، بەرهەمی کوردی بچێتە سەر زمانی عەرەبی.

چونکە بە پێی بوونمان لەم پارچەیەی وڵاتی عیراق، شارەزای ڕۆشنبیری‌و ئەدەبی عەرەبی هەین. هەندێکمان بەوەیش نەوەستاوە بگرە مەلەوانی چاکە.. گەلێ شیعری زەمانی «جاهلیە»مان دەبەرەو شوکر مانایشیان دەزانین.

زمانی عەرەبی، سەربارەت بە ئەدیبو نووسەرە کوردەکانی عیراق، پەنجەرەیەکی والآو کراوەیە.. ئەگەر ئەو نەدەبوو شارەزای ئەدەبیاتی ئینگلیز وفەرەنساو ئەڵمان نەدەبووین.. هەر بۆیەش خۆمان بە قەرزاری ئەم زمانە دەزانین.

لە گەڵیّ لە چاوپێکەوتنو کۆنگرەکاندا، یاخەو بەرۆکی رۆشنبیری عیراقی «عەرەب» مان دەگرت. هەندێکمان بەوەیش ناوەستیّو پەنجەی تۆمەتی بۆ درێژ دەکا:

«بۆچی شیعری ئەسپانی دەخوێنیتەوەو شاعیرەکانی ئەفریقیا دەناسی.. کەچی من لە هەموو دیدارو کۆنگرەیەکدا لە گەڵتام..

نە ناوم دەزانیو نە بەرهەم دەبینی ؟».

پێمان وابوو، ئەو خۆی تاکو تەنیا بەرپرسیارە.. ئێستاکێ ئەم مەسەلەیە ووردە ووردە روون دەبێتەوە. گوناهی هەرە گەورە دەکەوێتە ئەستۆی وەرگێری کورد، کە نەیتووانیو دەنگی بەرزبکاتەوە. ئەوشتی خەڵکمان بووەردەگێریّو شتی خۆمانیش هیچ.

پێویستمان بە چەند وەرگێرێکی نەترس هەن.. نەك بە حسێبی زیانو قازانجی پارەو دراو، بەڵکو بەو حسێبەی کە تخووبی هەرێمایەتی بشکێنێ.

بازاری کتێبی عەرەبی، بازارێکی فراوانە.. بۆ خۆمانی تێ نەکەین ؟ پێم وایە ئەگەر دەزگا دەوڵەتییەکان،بەمە هەڵسن، سەرکەوتوو دەبن.. ئەگەر لە پلانی سالآنەدا چەند بەرهەمێکی بەکەڵك بخەنە بەردەست عەرەبی زمانەکان، ئەوە خزمەتێکی دووسەرە دەکەن.

یەکەم، وەکو پردێك بەکار دەهێنرێ.. دووەمیان، خزمەتی رۆشنبیریی عیراقی دەکا.

●

# روون‌کردنه‌وه‌یه‌ك..

د. وریا عمرامین

خۆ به‌ستنه‌وه به په‌یره‌ویك و دانانی سنوور بۆ لیكۆڵینه‌وه سیمای كاری ئه‌كادیمی‌یه. هه‌ر باسێك ئه‌م لایه‌نانه‌ی تیا ره‌چاو نه‌كرێت سه‌رپێیی ده‌رئه‌چێ. ره‌خنه‌گریش ئه‌بێ له‌ناو چوارچێوه‌ی ئه‌م په‌یره‌و و سنووره‌وا باسه‌كه هه‌ڵبسه‌نگێنێ و كه‌م وكوڕی‌یه‌كانی ده‌رخات، نه‌ك په‌ر بداته ده‌ره‌وه‌ی. ئه‌بێ باسه‌كه له‌گه‌ل ئه‌وانه‌ی پێشتر بلاو كراونه‌ته‌وه به‌راوورد بكات و پیشانی بدات چی تازه‌ی تیا پێشكه‌ش كراوه و گرنگێتی ی ئه‌م شته تازه‌یه له‌و مه‌یدانه‌دا چی‌یه و تاچ راده‌ییك نووسه‌ره‌كه له‌پێشكه‌ش كردنیا سه‌ركه‌وتوو بووه... هتد.. ئه‌گینا نابێ به ره‌خنه.

له به‌رگی (۱۲)ی ساڵی (۱۹۸۵)ی گۆڤاری كۆڕی زانیاری‌ی عیراق - ده‌سته‌ی كورد (ل ٤٥ - ۹۳)، له ژێر ناوی - جێناوی كه‌سیی جودا له زمانی كوردیدا - ووتارێكی د. ئاوره‌حمانی حاجی مارف بلاو كراوه‌ته‌وه تیایا له باره‌ی ووتارێكمه‌وه كه له ژماره (۱۰)ی ساڵی (۱۹۸۳)ی هه‌مان گۆڤاردا بلاوكراوه‌ته‌وه ئه‌ڵێ:

[دووه‌م وتار كه به ناوی «لایه‌نێكی جیاوازی» یه‌وه‌یه و نووسه‌ره‌كه‌ی د. وریا عومه‌ر ئه‌مینه، به‌شێكی كه‌می ده‌رباره‌ی جێناوی كه‌سیی جودایه. باشیی ئه‌م لێكۆڵینه وه‌یه به تایبه‌تی له‌وه‌دایه، كه له‌سه‌ر شێوازێكی زانستیی نوێ نووسراوه، به‌لام به‌گشتی باسێكی قووڵ نییه‌و كه‌ره سته‌ی زمانی كوردی كه‌م تێدایه‌و ناته‌واوی زۆره.

د. وریا له نه‌خشه‌ی ژماره ۳ دا (بڕوانه: ل ۲٦۱) و له‌سه‌رپاكی نووسینه كه‌یدا له ده‌سته‌ی B ی جێناوی كه‌سیی جودا له دیالێكتی كرمانجیی ژووروودا بۆ كه‌سی دووه‌می كۆ (هون)ی نووسیوه. وه‌ك پێشتر لێی دوام ودواتریش باسم كردووه، (هوون) پتر له (هون) به‌كاردێ. سه‌رنج ڕاكێش، ئه‌وه‌یه كه له‌نێو نووسه‌رانی كورددا ته‌نیا مامۆستا جگه‌رخوێن (هون)ی تۆمار كردووه.

ئەگەرچی نووسەرباش دوو دەستە جێناوی کەسیی جودای لە کرمانجیی ژووروودا دەست نیشان کردووە، بەڵام ئەوەی یادداشت نەکردووە، کە ئەو دوو دەستەیە بەپێی دۆخ جیادەبنەوە.

دابەش کردنی جێناوە کەسی یە جوداکان و چۆنیەتی بە کارهێنانیان و بەراوردکردنیان لە لایەن زانایانی کورد و پێگانەوە، بە زمانی کوردیو بیگانە تارادەییێك باس کراوە، کەچی د. وریا پەنجەی بۆ هیچ یەکێك لەوسەرچاوانە ڕانەکێشاوە.

ئەو نموونانەی نووسەر بۆ ئیسپات کردنی باسەکەی هێناونی یەوە، لە قووڵایی زمانی کوردییەوە نین، واتا لە فۆلکۆر و ئەدەب و... ی تۆمار کراوەوە نین، بەڵکو ڕستەی سادەی زمانی خۆی یان ناسیاوێکیتی... و هەندێکی تر].

گەر رەخنەگر ناسناوێکی ئەکادیمیی بەرزی نەبا ئەم روون کردنەوەیەم نەئەخستە روو.

ئەوەی بەلامەوە زۆر گرنگە و بەپێوسیتی ئەزانم روونی کەمەوە ئەو بەشەی راکانیەتی کە ئەڵێ [... بەڵام ئەوەی یادداشت نەکردووە کە ئەم دوو دەستەیە بە پێ ی دۆخ جیا دەبنەوە].

وەك دەرئەکەوێ رەخنەگر لە مەبەستی من نەگەیشتووە.. ئەم ووتارە هەولدانێکە بۆ پێشاندانی سیستەمی کارکردنی راناو لە زمانی کوردی یا بەگشتیو دەست نیشان کردنی یاساکانیانە.. تیایا پیشانی ئەدەم و ساغی ئەکەمەوە کە دابەش کردنی دوو دەستە جێناوی کرمانجی ی ژووروو بە پێ ی دۆخ هەلەیە. ئەم دوو دەستەیە هەرگیز ناشێ بەپێ ی دۆخ جیا بکرێنەوە چونکە هەر دوو دەستە هەر دوو دۆخی راستەوخۆ و تیان لە دوو کاتی رێزمانی ی جیاوازدا پێشان ئەدەن.

هەموو ئەوانەی ئەم دوو دەستەیەیان بەپێ ی دۆخ جیا کردۆتەوە لە چۆنیەتی کارکردنی ئەم راناوانە نەگەیشتوون و لە ژێر کارتێکردنی رێزمانی زمانی تر وا تێگەیشتوون کە هەبوونی فۆرمی جیای راناو بەلگەی هەبوونی دۆخی جیاوازە. گەر ئەمە لەگەل زمانی رووسی یا (بۆنموونە) وابێ.. لەگەل شێوەی کرمانجی ی ژووروودا مەسەلەکە بە تەواوی بە جۆرێکی ترە.

لە کرمانجی ی ژووراوودا دوو دەستە راناوی جوداو یەك دەستە راناوی لکاو هەیە. دابەش بوونیان بەپێ ی کەس و ژمارە لەم نەخشەیەدا روون کراوەتەوە

| ژمارە | کەس | راناوی جودا ١ | راناوی جودا ٢ | راناوی لکاو |
|---|---|---|---|---|
| تاک | ١ | من | ئەز | م |
| | ٢ | تە | تو | ی |
| | ٣ | وی/وێ | ئەو | ـ،ت/ەت |
| کۆ | ١ | مە | ئەم | ین |
| | ٢ | وە | هوون | ن |
| | ٣ | وان | ئەو | ن |

لە گەڵ فرمانی تێپەڕا.... کۆمەڵی یەکەم گەر کاتی فرمانەکە رابردوو بێ دەوری (بکەری ـ واتا دۆخی راستەوخۆ) ئەبینێ. گەر کاتەکە داهاتوو بێ دەوری (بەرکاری ـ واتا دۆخی تیان) ئەبینی. کۆمەڵی دووەم لەگەڵ کاتی رابردوودا دەوری (بەرکاری ـ واتا دۆخی تیان) ئەبینێ و لەگەڵ کاتی داهاتوودا دەوری (بکەری ـ واتا دۆخی راستەوخۆ) ئەبینێ. وەك لەم نموونانەدا روون کراوەتەوەتەوە.

| بکەر<br>دۆخی راستەوخۆ<br>دەستەی یەکەم | بەرکار<br>دۆخی تیان<br>دەستەی دووەم | فرمان<br>رابردوو |
|---|---|---|
| من | تو | دیتی |
| تە | ئەز | دیتم |
| وی/وێ | ئەو | دیت |
| مە | هوون | دیتن |
| وە | ئەم | دیتین |
| وان | ئەو | دیتن |

| بکەر<br>دۆخی راستەوخۆ<br>دەستەی دووەم | بەرکار<br>دۆخی تیان<br>دەستەی یەکەم | فرمان<br>داهاتوو |
|---|---|---|
| ئەز | تە | دبینم |
| تو | من | دبینی |
| ئەو | وی/وێ | دبینی |
| ئەم | وە | دبینیین |
| هوون | مە | دبینن |
| ئەو | وان | دبینن |

سەیرکە لە رابردوودا فرمان لەگەڵ بەرکارا لەکەس وژمارەدا رێك ئەکەوێ. واتا فرمان راناوێکی لکاو وەرئەگرێ بە پێی کەس و ژمارەی بەرکارەکە. کەی بەرکار لاچوو راناوی لکاویش رئەچێ.

تە ئەز دیتم ← تە دیت

من تۆ دیتی ← من دیت

وان هوون دیتن ← وان دیت

هەر ئەو دیاردەیە شە وای کردووە هەموو ئەوانەی لە فرمانی کرمانجیی ژووروو کوڵیونەتەوە واتی بکەن کە فرمانی تێپەڕ لە رابردوودا راناوی لکار وەرناگرێ..

دەوری ئەم راناوانە بەپێی دۆخ لەم نەخشەیەدا روون کراوەتەوە.

واتا هەردوو دەستە هەردوو دەوری دۆخی راستەوخۆ و تیان لە دوو کاتی ڕێزمانیی جیاوازدا ئەبینن.. ئیتر بە چ مەنتقێ ئەشێ ئەم دوو دەستەیە بە پێی دۆخ جیا بکرێنەوە گەر بەم جۆرە نەبێ کە پێشکەش کرا..

د. ئاورەحمان ئەڵێ.. [باشی ئەم لێکۆڵینەوەیە بە تایبەتی لەوەدایە کە لە سەر شێوازێکی زانستیی نوێ نووسراوەتەوە.. بەڵام بە گشتی باسێکی قوول نییە و کەرەستەی زمانی کوردی کەم تێدایە..]

ئەم قسانە یەك ناگرنەوە.. گەر باس و لێکۆڵینەوە زانستی بێ ولە سەر شێوازێکی زانستی نوێ نووسرابێتە وە ئەبێ شتێکی تازەی بەدەستەوە دابێ و هەر بنێشتە تاڵەکەی پێش خۆی نەجووبێتەوە.. باس و لێکۆڵینەوەی زانستی ئەوەیە هەڵەیەکی باوی راست کردبێتەوە.. قاعیدەی بۆ دیاردەیێ دانابێ.. شتێکی ساغ کردبێتەوە نووسەرەکە لە نووسینا فەلسەفەی هەبێ و خۆی بە پەیرەویکەوە بەستبێ.. سنووری بۆ باسەکەی دانابێ... هتد. ئیتر چۆن ئەشێ بووتری لەسەر شۆازێکی زانستیی نوێ نووسراوەتەوە و ناتەواوی ی زۆرە ؟.

من لەم ووتارەدا هەڵەیەکی باوم راست کردۆتەوە. باسی بابەتێکم کردووە و قاعیدەکەیم دەست نیشان کردووە (وەك من بزانم) هیچ زمانەوانێ پێشتر بۆی نەچووە و نەیتوانیووە بەم شێوەیە لێکی بداتەوە، بێ ئەوەی ناوی ئەم و ئەو بهێنم و بڵێم ئەوان بە هەڵەدا چوون و من راستم..

د. ئاورەحمان ئەڵێ [ئەو نموونانەی نووسەر بۆ ئیسپات کردنی باسەکەی هێناونییەوە لە قووڵایی زمانی کوردییەوە نین].. وا دیارە نموونەکانی من لە توێکڵی زمانی کوردییەوەن.. لەسەرەتای ووتارەکەما (ل ٢٦٠) ئەڵێم [لەم ووتارەدا باسی راناو ئەکرێ لە رووی سینتاکسەوە. واتا پەیوەندیی راناوی لکاو بە بەشەکانی تری رستەوە. بۆیە لێکۆڵینەوەکەم لە رووی لێڤلەکانی تری زمانەوە ساکار دێتە بەرچاو]. من کە خۆم وا بڵێم ئیتر باس نەکردنی لایەنی مۆرفۆلۆجی بۆ بە کەم وکورِی لەقەڵەم بدرێ.. باسەکەی من سینتاکسییە. بۆ ئەم جۆرە باسانە یەك دەستە وەك نموونە هەڵئەبژێرریە ئەم دەستەیە وەك (ستاندەرت) تەمسیلی هەموو فۆرمە جیاوازەکانی شێوەکانی زمانەکە ئەکات.. جا (هون)م نووسیبێ یا (هوون) هیچ لە مەسەلەکە ناگۆرِێ و پەیوەندی بە گەوهەری باسەکەوە نییە..

د. ئاورەحمان ئەڵێ [دابەش کردنی جێناوی کەسییە جوداکان چۆنیەتی بەکار هێنانیان و بەراوورد کردنیان لە لایەن زانایانی کورد و بێگانەوە بە زمانی کوردی و بێگانە تا رادەیێك باس کراوە. کەچی د. وریا پەنجەی بۆ هیچ یەکێك لەو سەرچاوانە رانەکێشاوە].

هۆی ئاماژە نەکردنم بۆ ئەو سەرچاوانە ئەوەیە چونکە هیچ سوودێکم لێ وەرنەگرتوون.. ئەوەی من باسی ئەکەم هەموو ئەنجامی لێکدانەوەی خۆمن و

کەس پێشتر بەم جۆرە بۆی نەچووە و باسی نەکردووە. لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی پەیرەوی تایبەتی ی خۆی هەیە لە دەست نیشان کردنی سەرچاوەکانا. لە هەموو شت ئاسانتر ریز کردنی سەر چاوەیە، بەلاَم چۆن ؟ وا کتێبێکم لەژێر دەستایە گوایە ئەتروحەی دکتۆرایە.. نووسەرەکەی نزیکەی دوو سەد سەرچاوەی بۆ ریز کردووە و بە چەن زمانێ.. لەو بڕوایە دام گەر نووسەری ئەم کتێبە بە چاکی تەنیا لە چواری ئەم سەرچاوانەی ریزی کردوون بگەیشتایە بەرهەمەکەی وا پووچ دەرنە ئەچوو..

حەزم ئەکرد د. ئاورەحمان نەختێ مەوزووعی با لە هەڵسەنگاندنی ئەم ووتارە و هەر بەو گیانە ئەکادیمی یە پتەوەی من ئەیناسم سەیری بکردایە.

لە گەڵ رێز وخۆشەویستیم بۆ مامۆستاو هاورێم د. ئاورە حمانی حاجی مارف.

●

بڵێن بەیار، بڵێن بەیار، یاری نازدار،
سەد هەزار جار خۆزگەم بەپار، منی هەژار
خۆزگەم بەپار !
خۆزگەم بەساڵی رابردوو،
عومری کورتی دلداریم بوو،
لە پڕ هاتوو، لە ناکاو چوو..
یەك پڕ بە دونیا ئارەزوو،
دەریایەك تاسە.. ئەمە دوو
جێ مابوو لە یاری مردوو !..

ـ گۆران ـ

# راز

رمضان زامدار

بەسیەتی تاکەی نازت ئەنوێنی
خەریکی جەرگەو دلم ئەستوێنی
بۆ وا ئەمکوژی هەر بە داخەوە
بە نا ئومێدی.. دەم بە ئاخەوە

× × ×

گرفتارم... بۆت ئەزارم
بریندارم... نامدوێنی

× × ×

بۆچی بەزەییت نایە بە دڵما ؟
هاورێتیم تاکەی، نایەی لە گەلما ؟

× × ×

بۆ وەکو جاران نەماوی ئێستە ؟
دلەی هەژارم زۆر تۆی پێویستە !!

× × ×

بۆ تۆ پێکەنیم.. بۆ تۆ خولقاوم
بە هۆی یادگری تۆوە ژیاوم

× × ×

کوانێ چی ی لێهات، کوا دلەی نەرمت ؟
کوا خۆشەویستی پڕ گڕو گەرمت ؟

× × ×

بۆ وا ئێستاکە هیچی نەماوە.....؟
پێم بلێ بۆچی ؟ چی‌یە رووی داوە.....؟

× × ×

بەسیەتی هەموو ئارامم بڕا....
لە ناڵەو شیوەن وا دەنگم دڕا....

× × ×

گرفتارم... بۆت ئەزارم
بریندارم... نامدوێنی

کرکوك

٤ ـ لە رۆژی یێکەمی مارتدا وەزیری ناوبراو لەندەنی بەرەو میسر بە جێ هێشت. ئەم کار بەدەستانەی خوارەوەی لەگەل:
ـ ماریشالی فروکە سێر هیوز ترینچارد، سەرۆك ئەرکانی هێزی هەوایی لەگەل فەرمانبەرانی لێژنەی رۆژ هەلاتی ناوەڕاستدا.
ـ مێجور ـ جنرال سێر رادکلیف، بەڕێوەبەری کاری هێزی چەکدار.
ـ مستەر کروسلاند، لە دەزگای دارایی وەزارەتی شەڕ.
ـ سێر ج. بارستاو، ئەمینداری دارایی و پارە کە گەیشت بۆ قاهیرە. لە رێگا، لە مارسیلیاوە بۆ ئەسکەندەریە وەزیر (چەرچل) پروگرامێکی بۆ کۆنگرەکە دانا. (پاش بەند ٥).
ـ لیفتنانت ـ جنرال سێر ولتەر کونگریف فەرمانبەری بەرزی سوپای میسرو فەلەستین بوو بە سەرۆکی لێژنەی سوپایی و دارایی لە کۆنگرەکەدا. لە سایەی ئەم کۆنگرە کە زۆر باش بەڕێوە چوو.
٥ ـ لیستەی بەشدار بوەکانی کۆنگرە بە پێی کۆمەلی نوێنەرەکانی هەر ناوچەییێکدا لە پاش بەندی ٤ دایە.
یێکەم کۆبوونەوە لە ١٢ مارتدا بەسترا لەوێدا وەزیری ناوبراو مەبەسی خۆی لە بەستنی ئەم کۆنگرەیە روون کردەوە وە پروگرامی پیرەوی کۆنگرەی شی کردەوە، دوا بە دوا، کۆنگرەکە لە سەر چەند لێژنەیەك دابەش بوو، بە پێی ئەو مەبەستانەی کە لێیان ئەکۆلرێتەوە. بە گشتی ئەم مەبەستانە دوو جۆرن: بەشی رامیاری، بەشی سوپا. مستەر پاددوك کە لە دایەرەی مەندوبی سامی فەلەستین وەرگیرابوو، بوو بە ئەمینداری گشتی کۆنگرەکە، بە تایبەتی لێژنە رامیاریەکان. هەر وەها لیفتنانت جنرال ولتەر ستایلەر بوو بە ئەمینداری لێژنە سوپاییەکان لە ژێر فەرمانی وەزیردا.
ئەم دوو فەرمانبەرانە بەم ئەرکە گەورەیە هەلسان. بە تایبەتی مستەر پاددوك کە لە سایەی ئەم ناوەڕۆکێ کوششی لێژنەکان لە چل تا پەنجا کۆبونەوە بە روونی و رێك و پێکی تۆمار کراون، لە نێو رۆژانی ١٢ تا ٢٣ مارت دا.
٦ ـ لە شەوی ٢٣ مارت وەزیری ناوبراو قاهیرەی بەجێ هێشت و چووە قودس، کە لە دواییدا کۆبونەوەی زۆرتر بەسترا بۆ لێ کۆلینەوە لەسەر فەلەستین و وولاتی ئەردون. لە هەمان کاتدا ژمارەییێکی زۆر لە نوێنەران سەریان لە وەزیرو ئەندامانی کۆنگرەدا وە لە گەلی ناوچەدا بە گەشت گەڕان. لەم رۆژەدا مستەر بارستاو لە لەندەنەوەهاتە قاهیرە وسەرپەرشتی گەلێك لێژنەی دارایی سەر بە میسوپوتامیای کرد.

# «سێبەر»

لە سێبەری خۆم بەشکم
پێ بە پێی من جێ ئەگۆڕێ
وتم.. ئەبێ بی ترسێنم
چوومە چیقی گلۆپێکی سەر شەقامێ..
کەوتە ژێر پێم.
تۆپەڵێك بوو خۆی مات دابوو
کەتیشکێ هات، بەرەو رووی من ئاراستە بوو،
رووم وەرگێڕا بەرەو دواوە
بینیم.. سێبەری تۆپەڵم
دوو هێندەی خۆم راکشابوو !.
- با، بی کوژم..
وتیان نەکەی،
ئەبێ بچیتە سێبەرێ..
هەرچی تروسکەت تیا هەیە
هەمووی بەرێ.

# «ئاوەرێژە»

حەسیب قەرەداخی

ئێستە گەیشتمە ئەو پێچەی کە ئەو دیوی
سەرەو لێژە
ئەم هەنگاوەی کە دام ناوە
نیوەی لە سەر ئاوەرێژە
ئەوا هاتوو لام کردەوە،
کێ ئەبینم..
چی ئەچێنم..
لە تەك خۆما چی ئەهێنم ؟!
کێ دەست ئەخاتە سەر دلی،
ئەحەپەسێ ؟!
کێ بەرد بە دواما هەڵ ئەدات
بە ژمارە، هەتاکوو سێ ؟..
لە دوای «نالی» منیش شاری خێوو خەمم خستە دواوە
ئەی من بۆچی وەکوو نالی
ئەم کۆچەم لێ نەوەشاوە ؟!..
کە شیعرێکی خۆم خوێندەوە - چێم مەهێڵە -
ئەوسا دەرکەوت
کە کۆچی شاری خێوو خەم
پێشی ئێمەی داماویش کەوت !.

٩٨٥/٣/٢

# چوار فرمێسکی گەرم

□ محمەد بەدری □

١ - وەلی بۆ شەم
زۆر رەنج و ئازاری کێشاو
بوو بە گیروودەی داوی خەم
هەروەلیش بوو
کە لە غوربەت بە نامۆیی
سەری داناو
ئەو ئاواتەی لە دڵیا بوو
بۆ گۆڕ بردی و کرایە تەم
بەلام
ئەوەی لە فەرهەنگی دڵداریدا
بووەتە سیمفۆنیای دەماو دەم
تا نە بێژێ
ئەز ئەڤیندارا وەلی مە
کەس نابێژێ
چاوانی شەم ؟!

٢ - کە ئەتەوێ وەك بولبول بی
ئەبێ ئەڤینداری گوڵ بی
کە ئەتەوێ وەکو گڕ بی
ئەبێ دڵداری ئاگر بی
بەلام
کە پێت نەکرێ گوڵ بی
یاخود رۆژێ وەك ئاگر بی
ئەبێ لە فەرهەنگی عەشقا
ووشەیەکی ساردو سڕ بی

٣ ـ لە قازی نەمریان پرسی
کاتێ ڕوو بەڕووی
سێدارەی مردن کرا
وتیان:
زۆر سەیرە ناترسیو
ئەژدەهای مەرگ هیچ نەماوە
بتخاتە سووچی ماجەرا
وتی: ئەگەر من بترسم
ئەی گوایە چۆن
بۆ چوارچرا خامۆشەکە
ببمە رووناکیو چرا ؟

٤ ـ بابا تاهیر
لە مێژەوە دڵسووتاوی
دەستی هێنانو مردنە
بابا تاهیر
تا ئیستاکەش ئاوارەیەو
پێناسەکەی هاوار ئەکا:
ئەم کابرایە دەریایەکی بێ خاوەنە
بابا تاهیر
ڕۆژ بە دوای ڕۆژ
هەر فوتبۆڵێنی پێ ئەکرێ
کەچی هەر وەك کێوی بێستوون
دژ بە لە ناو چوون ئەوەستێو
ئەوەی لە فەرهەنگیا نەبێ
تەنیا نەمانو مردنە...

# دایە.. لێمببورە

□ نوری عەلی ئەمین □

(١)

دایە.. دەزانم..
پیرو کەفتەکاری..
ماندووی دەستی ڕۆژگاری..
فرمێسکت بەبار هەڵرشتووە..
دەربەدەریت زۆر چەشتووە..
لە یادمە:
لەگەڵ باوکە میوانەکەی گردی سەیوانمدا،
لەتاو فڕۆکەکانی ئینگلیزی بەدکار..
بە کوڵ،
ئەم دێو ئەو دێتان پێدەکردم..
لە ئەشکەوتەکەی بەر تەگەراندا[1]،
دەتان شاردمەوە..
بە داستانی شۆڕە سوارانی،
شێخ مەحمودی نەمر، دەتان نواندم..
هەتا:
لە گرمەگرمی فڕۆکەکان،
لە تەقینەوەی بۆمباکان،
خەو لە چاوم نەفڕێ..

گوڵلەی ویڵ جەرگم نەبڕێ..
نەکو نەگەم:
داستانی گەلەکەم بخوێنمەوە،
کارەساتی کۆن و نوێی تێدا ببینمەوە..

(٢)
دایە.. لێم بووورە،
دەمەوێ، دیسان:
بە سۆزەکەی جاران،
سۆزەکەی بەر ئەشکەوتەکەی تەگەران،
بت هروژێنم..
فرمێسکت بەخوڕ پێ ببارێنم،
بت گرێنم..
بەڵام، ئەم جارە، بۆ من.. نا:
بۆ دوا ڕۆژی کورد،
بۆ بەهاری ڕەش داگەڕاو،
بۆ گوڵی چاو بەفرمێسك،
بۆ دارستانی چڕی گڕگرتوو،
بۆ مەهابادی قازی محەمەد،
بۆ قەڵای دمدم،
مەڵبەندی خانی لەپ زێڕین..
بۆ کانیو سەرچاوەی،
بۆ قەدەمخێر
پڵنگی پێکراوی کوردستانی ئێران..
بە بارووت هەڵتەکێنراو، دەت گرێنم..

(٣)
بەڵام، هەر تۆ، ناگریێنم؛
خوێنی خۆشم دەڕژێنم..
وەك بەچکە کوردێکی دلێر،

بەرگی شەرمەزاری فڕیدەدەم..
شاڵو شەپکی بادینان،
پووزەوانەی مەریوان،
کولەباڵی هەوارمان،
کڵاوی شکاکان،
کاڵەو پێتاوی خۆمان، دەبەستم..
بەرەو هەورازی ڕزگاری ملدەنێم..
ڕێگای سەختو،
پڕ هەڵدێر، دەبڕم..
سنوور دەشکێنم..
بەرەو کوردستانی ئەو دیو،
دەکەومەڕێ..
دڵنیابە.. کۆڵم بە مەرگ داوە،
لەژێر پێمدا تاساوە..
لەگەڵ ووشەی (ترس)دا،
دەیانکەم بەگڕ..
دوژمنی پێدە سووتێنم..
گوێ نادەمێ:
با دوژمن وەك هەوری بەهار بگرمێنێ،
گوللە بە لێزمە ببارێنێ،
بازووی بەخوێن سوورکراوی،
لەگەڵ کوردی هەزاردا بنوێنێ..
لە کۆشکی زۆرداریدا،
تاوان بە باڵی فڕۆکەکانیدا بنێرێ،
لەگەڵ گوللە تۆپەکاندا،
گڕو فرمێسکمان بۆ هەڵ بدا،
شارەکانمان بهێنێتە گریان...
کۆڵ نادەین...
تێدەکۆشین.. چونکە:
بە دوای حەقدا دەسووڕێینەوە..

حەق بە خوێن وەر دە گرینەوە..
ناگەڕێینەوە،
شاڵاو دەبەین،
تۆڵەی برا کوژراوەکانمان،
خوشکە بەپرچ هەڵواسراوە کانمان،
لە زیندانەکانی تاراندا، دەکەینەوە..
لە سەنگەری ڕزگاریدا، دەجەنگین،
دوژمن دەبەزێنین،
خوێنی دەڕژێنین،
ڕەگەز پەرستەو ئەی بوغزێنین..

(٤)
دایە... سەرێکەو بردوومە،
نای هێنمەوە..
هەتا کوردی بەسەرکەوتوویی،
تێدا نەبینمەوە..
سوێندت بۆ دەخۆم:
بە خۆر، نە... بە تیشکەکەی..
بە نەوروز، نە.. بە بڵێسەکەی..
هەتا گیان لە لەشم دەتۆرێ،
هێز تواناى تێدا نامێنێ،
پشت نەکەمە دوژمن..
روو لە کوردی کەساس،
لە جوتیاری دەست بەداس،
لە کرێکاری ماندوو، وەرنەگیرم..
بۆ پارەو پوول خۆم نەدۆڕێنم..
بڕیار بێت، بڕیاری مەردانە:
گڕێ لە خۆر دروست بکەم،
هەموو شەهیدەکان بانگ بکەم،
لەبەریدا خڕ ببینەوە،